# بسم الله الرحمن الرحيم

إن الْحَمْدُ لله نحمده و نَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوذُ بِاَّلله مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا مَنْ يَهْدِهِ الله فَلَا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَا هَادِيَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا الله وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا الله حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ )

(يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا الله الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ الله كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا)

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا الله وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعْ الله وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا)

أما بعد:

**پاش وسوپاس و ستایشی خوای گەورە بۆ ئەم دەرفەتەی کەپێی بەخشیم کە بتوانم بۆ یەکەم جار قەڵەم بگرمە دەست و نامیلکەیەکی بچووک بنوسم لە ژێر ناونیشانی وەڵامدانەوەی (٥٠) پرسیاری شەرعی کە بە ڕاستی جێگای فەخرو شانازیە بۆم. هەروەکو ئەو هەموو ئیماندارە باشانەی ڕابوونی ئیسلامی کە خزمەت دەکەن بەم ئیسلامە پیرۆزە منیش ڕێگەی ئەو پیاو چاکانە بگرمە بەرو خزمەت کاری ئەم ئیسلامە بم، داواکارم لە خوای گەورە لەدوای مردنیشم سودو قازانجم پێ بگەیەنێت و ئەمە کۆتا نوسین نەبێت بە پشتیوانی خوای گەورە، ئەوەی کە جێگای باسە لێرەدا بۆ وەڵامی پرسیارەکان تەنها وەک قووتابییەکی کاروانی پێغەمبەری ئەکرەم محمد (علی الله علیە وسلم) وەڵامم داوەتەوە بەپێی بەڵگەی ئایەت و فەرموودە پیرۆزەکانی پێغەمبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)وە سوپاس بۆ خوا تا توانیبێتم لە شتێکدا ئەگەر جیاوازی ڕای لەسەر بووبێت هەردوو ڕاکەم باس کردوە، بەڵام کامیان نزیکترن لە قورئان و سووننەت ئەوەیانم بە بەهێزتر پیشان داوە بەبێ دە مارگیری کوێرانە.**

**لە كۆتایی ئەم پێشەكیەدا داواكارم لە خوای پەروەردگار ئەم نامیلكە بچووكەم بۆ بكاتە تویشوی قیامەت ئەگەر بە هەڵە وەلامێكم دابێتەوە ئەوە لە خۆمەوەیە داوای لێبوردن لە خوای گەورە دەكەم، وە ئەگەر ڕاست و تەواو بوو ئەوە لە خوای گەورەوەیە وە داواكارم لە خوای گەورە زیاتر یارمەتیم بدات بۆ فێربوونی عیلمی شەرعی.**

**ئەوەی كە جێی باسە لێرەدا باسی بكەم سوپاس و دە ست خۆشیە لە مامۆستای بە ڕێزو خۆشەویستم مامۆستا كرێكار كە چاوی خشاندەوە بە پرسیارە كانداو هاندەرم بوو بۆ ئەم كارە و داوای نوسینی سەنەدی فەرموودە كانی لێكردم منیش سوپاس بۆ خوای گەورە هەوڵم دا سەنەدەكان كۆبكەمەوە و بیان نوسمەوە. سوپاسی برایانی سایتی ڕێگای ڕاستی دەكەم كە ماندوو بوون لە وەرگرتنی ئەم پرسیارانە و بەڕاپۆرت بۆیان دەناردم و منیش دوای وەلام دانەوە بۆم دەناردنەوە و لەسایتە ڕازاوەكەیاندا دایان دەبەزاند. دەست خۆشی لە خێزانی بە ڕیزیشم دەكەم كە یارمەتی دەرم بوو لە نووسینی وەلامەكان وە دە ست خۆشی لە خوشكی بە ڕێزم دادە شە وبۆ دەكەم كە یارمەتی دەرم بوو لە دانانی كلێشەی نامیلكەكەدا.**

**داواكارم لە خوای گەورە هە موو ئەو مامۆستا بەڕێزانەشی كە من لەوەلامی پرسیارەكاندا سوودم لە ووتەو كتێبەكانیان بینیوە بێبەش نەبن لەم كارە خێرەدا، خوای گەورە ش زیاتر یارمەتیمان بدات بۆ سەرخستنی دینەكەی**

**اللهم آمین**

**باوكی ئەسماء**

**٢٠٠٩/٤/٣٠**

**كات ژمێر٤:٤٢ دەقیقەی شەو**

١. ئایا تەوقەکردنی پیاو لەگەڵ ئافرەت حەرامە؟

**وەڵام:**

بسم الله الحمد لله الصلاة والسلام على رسول الله(صلى الله عليه وسلم) أما بعد:-

**بەڵێ تەوقە کردنی ئافرەتی نامەحرەم لەگەڵ پیاوی نامەحرەم یان بە پێچەوانەوە حەرامە بە بەڵگەی ئەوەی کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:**

(لأن يطعن في رأس أحدكم بمخيط من حديد خير له من أن يمس امرأة لا تحل له)

**صحيح الجامع الصغير رقم: (٥٠٤٥) وسلسلة الأحاديث الصحيحة رقم: (٢٢٦)**

**واتە:- ئاسن بکرێت بەسەری یەکێکتان دا باشترە بۆی لەوەی کە دەستی بەر دەستی ئافرەتێک بکەوێت حەڵاڵ نەبێت بۆی.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**٢. ئایا ئەگەر مافۆرێکمان هەبێت لەماڵەوە و ڕەسمی تیایە ئایا حەرامە؟ تکایە بە بەڵگەوە.**

**وەڵام:**

بسم الله الحمد لله الصلاة والسلام على رسول الله(صلى الله عليه وسلم) أما بعد:-

**بە سەرچاو بەڕێز گیان إن شاألله بێ بەڵگە وەڵام نادەینەوە بەنسبەتی پرسیارەکەتەوە ئەگەر وێنەکە وێنەی سروشت بوو ئەوە ئاساییە، بەڵام ئەگەر وێنەی گیاندار بوو ئەوا دانانی یان هەڵواسینی وێنەی گیانداران ئیتر ئەو گیاندارە ئینسان بێت یان ئاژەڵ بێت یان باڵندە بێت حەرامە بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە دەفەرموێت:**

(لاتدخل الملائكة بيتآ فيه كلب ولا تصاوير)

**الراوي: أبو طلحة زيد بن سهل الأنصاري المحدث: البخاري - المصدر: الجامع الصحيح - الصفحة أو الرقم: ٥٩٤٩**

**خلاصة الدرجة : [صحيح]**

**واته:- فریشتەی خوای گەورە ناچێتە ماڵێکەوە ئەگەر سەگ و وێنەی گیانداری تێدا بێت.**

**یان لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:**

(أنَّ الــملائكة لا تـدخل بـيتـاً فـيـه صورة ، وأنَّ من صنع الـصور يـعذب يـوم الـقـيـامة ، فـيُقـال: أحيـوا مـا خلـقتم)

**رواه البخاري ومسلم.**

**واته : بەڕاستی فریشتە ناچێتە ناو ماڵێکەوە وێنەی تێدا هەبێت، وە بەڕاستی ئەوانەی کە وێنە دروست دەکەن سزا دەدرێن لە ڕۆژی قیامەتدا، پێیان دەوترێت: زیندووی کەنەوە ئەوەی کە دروستتان کردووە.**

**جا با ماڵمان بێبەش نەکەین لە دروست کراوێکی خوای گەورە کە باشترین دروست کراوی خوای گەورەن، چونکە بێ هەڵە کەم و کورین وە لە دەریای خواپەرستی دا نقوم بوون نەوەک خوا نەخواستە ماڵمان ببێتە جێی حەوانەوەی شەیطان و نەوەکانی.**

**تێبینی:-**

**١- ئەگەر وێنەی گیاندارە کە لە ناو ئەلبوم دا بێت یان هەڵنەواسرابێت لە بەرچاودا ئەوە ئاساییە.**

**٢- بەنسبەتی سەگەوە زانایان بۆ دوو حاڵەت ڕێگەیان داوە کە لە ماڵدا ڕابگیرێت:**

**١- بۆ کەسێک کە دوژمن داربێت.**

**٢- بۆ کەسێک کەسەروەت و سامانی زۆر بێت بۆ پاسەوانی ڕای گرتبێت.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**٣. مێردەکەم ئەڵێت لەچک مەکە ئایا بەقسەی بکەم؟**

**وەڵام:**

## بسم الله الحمد لله الصلاة والسلام على رسول الله(صلى الله عليه وسلم) أمابعد:-

**بێگوومان خوشکی بەڕێزم گوێ ڕایەڵی کردنی هاوسەر وا جێیگی شەرعیە لە سەر ئافرەتان چوونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:**

(لـو كـنـت آمـرا أحـدآ أن يـسـجد لأحـد لأ مـرت الـمـرأة أن تـسـجد لـزوجـهـا)

**واتە:- ئەگەر فەرمانم بەیەکێک بکردایە کڕنوش بەرێت بۆ یەکێکی تر ئەوا فەرمانم دەدا بە کڕنۆش بردنی ئافرەت بۆ مێردەکەی.**

**مەبەستی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەم کڕنوش بردنە کڕنوشی ڕێزە نەک کڕنوشی پەرستن، کڕنوشی ڕێزگرتن لە ئوومەتەکانی پێش ئیسلام هەبووە، وەک چۆن دایک و باوکی پێغەمبەر یوسف (عليه سلام) کڕنوشی ڕێزیان بۆ برد بەڵام لە ئیسلامدا ئەم جۆرە کڕنوشە حەرامە.**

**بەڵام بەنسبەتی سەرپۆشە وە ئەمە فەرمانی خوای پەروەردگارە کە لە قورئانی پیرۆزدا فەرمان دەدات بە ئافرەتان خۆیان داپۆشن و جوانیەکانیان دەرنەخەن بۆ غەیری مەحرەمی خۆیان وەک لە سورەتی ئه حزاب ئایەتی ٥٩ دا دەفەرموێت:**

(يَـا أَيُّـهَـا الـنَّـبِـيُّ قُـل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَـنَـاتِـكَ وَنِـسَاءِ الْـمُـؤْمِـنِـينَ يُـدْنِـينَ عَـلَـيْـهِنَّ مِن جَلَابِـيـبِـهِنَّ ذَلِـكَ أَدْنَـى أَن يُـعْـرَفْـنَ فَـلَا يُـؤْذَيْـنَ وَكَـانَ اللهُ غَـفُـورًا رَّحِـيـمًا)

**واتە :- ئەی پێغە مبەر (صلى الله عليه وسلم) بەهاوسەرانت و کچەکانت و ئافرەتانی ئیماندار بڵێ کە بە پۆشاکی باڵاپۆش خۆیان داپۆشن ئەوە باشترین شتەکە پێی بناسرێن، تا ئازار نەدرێن**

و تووشی گیروگرفت نەبن، هەمیشە و بەردەوام خوا لێخۆش بوو میهرەبانە لەکەم و کوڕی ڕابردووتان خۆش دەبێت.

کەواتە خووشکی بەڕێزم ئێستا بۆمان روون بۆیەوە ئەمە فەرمانی خوای گەورە یەوە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی لە سەرو فەرمانی دایک و باوک و هاوسەریشەوەیە مادەم مێردەکەت داوای شتێکت لێ دەکات کە سە رپێچی فەرمانی خواو پێغەمبەری خوایە (صلی الله علیه وسلم) ئەوا نابێت بەگوێی هاوسەرت بکەیت چوونکە قسەکەی هاوسەرت لە ئەسڵدا ناشەرعیە وە ئەگەر باوەڕی بەوە نەبێت کەوا ئافرەت لەچک بکات ئەوە پەنا بەخوا لە دینی ئیسلام دەردەچێت وە بەو قسەیە کافر دەبێت خوا پەنامان بدات، وە ئەگەر بڵێت ئەزانم لە قورئان دا باس کراوە و واجبە، بەڵام حەزم لێی نیە وە ئەشزانم تاوانبار دەبین لە سەری ئە پێی کافر نابێت بەم قسەیە یان بەڵام لە دوا ڕۆژدا هەردووکتان سزا دەدرێن لە سەر جێبەجێ نەکردنی فەرمانێکی خوای گەورە، بەڵام سزای هاوسەرت توندترە خوا پەنامان بدات، کەواتە تەنیا دەبێت لە کارێکدا گوێ ڕایەڵی هاوسەرت بکەیت کەوا لە سنوری شەرع نەچێتە دەرەوە.

خوای گەورەش زاناترە.

٤- ئەگەر دەست نوێژت گرت و پاشان هەوایەک دەرچوو، ئایا دەبێت تارەت بگریتەوە؟

وەڵام:

## بسم الله الحمد لله الصلاة والسلام على رسول الله(صلى الله عليه وسلم) أمابعد:-

بە نسبەتی گرتنی تاراتەوە ئەمە بۆ پاک و خاوێنی کەسەکە خۆیەتی شەرتیش نیە بۆ هەموو دەست نوێژێک تارات بگیرێت مەگەر پێویست بکات وەک ئەوەی کەسەکە پێویستی بە تارات بێت لەڕاستیدا تارات گرتن هیچ پەیوەندیەکی بەدەست نوێژە وە نیە مەگەر لە کاتێکدا نەبێت لە کاتی دەست نوێژگرتنەکەدا هەوایەک لە پاشەوە دەربچێت وە هەست بکەیت بەوەی کە پیسایی لەگەڵ خۆیدا هێناوەتە دەرەوە یان لە پێشەوە چەند دڵۆپە میزێک هاتبێتە دەرەوە بێگوومان

دەبێت خۆت پاک بکەیتەوە ئەوجا دەست نوێژ بگریت وە ئەو زانا بەڕێزانەی کە تارات بەنیوەی دەست نوێژ دەزانن وابزانم لە هیچ دەقێکدا شتی وا نەهاتووە کە ئەممان بۆ پشت ڕاست بکاتەوە کەواتە ئەگەر زانیمان پێویستمان بە دەست بە ئاو گەیاندن دەبێت چاک وایە پێش دەست نوێژ گرتنە کە تارات بگرین وە ئەگەر پێویستیمان نەبوو یان هەوایەک دەردەچێت کەوا پیسی لەگەڵ خۆی دەرنەکات ئەوا دەتوانیت ڕاستەوخۆ دەست نوێژ بگرین بەبێ تارات گرتن.

**خوای گه ورەش زانا زاناترە.**

**٥-ئایا ئافرەت ئەبێت لەکاتی حەیزدا پیاوەکەی ڕەحەت بکات؟**

**وەڵام:**

## بسم الله الحمد لله الصلاة والسلام على رسول الله(صلى الله عليه وسلم) أمابعد:-

بێگوومان خوای گەورە لە سورەتی بەقەرەدا لە ئایەتی٢٢٢دا دەفەرموێت:

(وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُوا النِّسَاء فِي الْمَحِيضِ وَلاَ تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّى يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللّهُ.........)

واتە:-پرسیارت لێ دەکەن ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە بارەی حەیزەوە، تۆیش بڵێ: ئەوە زیانی هەیە، جا دوورکەونەوە لە جیماع کردنی ئافرەتان لە کاتی حەیزدا تا پاک دەبنەوە، جا ئەگەر شۆردیان ئەوە بچنەوە لایان و جیماعیان لەگەڵ بکەن لەو شوێنەوە کە خوای گەورە فەرمانی پێ کردووە. (لە ڕووی منداڵ بوونەوە).

وە هەروە ها أنس (خوای لێ ڕازیبێت) دە گێڕێتەوە کەوا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:- (إصنعوا كل شيء إلا النكاح)

رواه مسلم (٣٠٢/٢٤٦/١)

واته:- هەموو شتێکیان لەگەڵدا بکەن تەنیا جیماع کردن نەبێت.

کەواتە لەم ئایەت و فەرموودە وە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کەوا کاتێک ئافرەت لە کاتی حەیزدا بێت حەرامە جیماع کردن لەگەڵیدا، بەڵام لە فەرموودە کە وە بۆمان دەردەکەوێت کەوا ئافرەت و پیاو دەتوانن چێژ لە یەکتر وەربگرن و یەکتری ڕەحەت بکەن، بەڵام بەبێ جیماع کردن ئیتر وەک فەرموودەکە دەفەرموێت هەموو شتێکیان لەگەڵ بکەن کەواتە بەڵێ ئافرەت دەتوانێت پیاوەکەی ڕەحەت بکات لە کاتێکدا کە لە حەیزدایە، بەڵام ئاگاداری ئەوەبن کە جیماع نەکەن لەو کاتەدا چوونکە حەرامە.

هەروەها بۆ زیادە ڕوونکردنەوەیەک لە سەر ئەم مەسەلەیە ئیمامی نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت:

هەر کەسێک باوەڕی وابێت جووت بوون لەگەڵ ئافرەتەکەیدا حەڵاڵە کاتێک لە حەیزدا بێت، ئەوە پێی کافر دەبێت وە ئەگەر یەکێک ئەو کارە بکات، بەڵام بیرو باوەڕی وا نەبێت کە حەڵاڵە، ئەوە ئەو کەسە ئەگەر لە بیری چووبێت یان نەزانێت ئافرەتەکەی لە حەیزدایە یان نەزانێت حەرامە یان مەکروهە ئەوە تاوانبار نابێت و کەفارەتیشی لەسەر نیە، بەڵام ئەگەر بە قەست و زانینەوە ئەو کارە بکات بە بێ هیچ زۆر لێکردنێک، ئەوە تاوانێکی گەورەی کردووە.

ئیمامی شافیعی دەفەرمووێت:- تاوانی گەورەیە و پێویستە لێی پەشیمان ببێتەوە وە تەو بەی لێ بکات.

خوای گە ورەش زانا زاناترە.

٦-ئایا فەتوا هەیە لەسەر فەرزبوونی جیهاد؟ لەم سەردەمەدا

وەلام:

بسم الله الحمد لله الصلاة والسلام على رسول الله(صلى الله عليه وسلم) أمابعد:-

بۆ ئەم وەڵامە سەرەتا دەبێت بگەڕێینەوە بۆ دەقی قورئان و فەرموودە کە بەجوانی بۆیان ڕوون کردوینەتەوە.

جیهادکردن خۆی لە ئەسڵدا بە فەرزی ((کیفایە)) دەستی پێ کرد لە غەزای بە دردا، بەڵام ئەمە لە کاتێک دایە ئەگەر ئەوانەی بەو جیهاد کردنە هەڵدەستن بەس بن وە جیهادەکەی پێ ڕا پەڕێت، بەڵام ئەگەر ئەوە ئەنجام نەدرا ئەوە دەبێتە فەرزی ((عە ین)) لەسەر هەموو مسوڵمانان، وە هەمووشی پێی تاوانبار دەبن ئەگە ر پێی هەڵنەستن.

جیهاد لە ٣حاڵەتدا دەبێتە فەرزی ((عە ین))

١-ئەگەر مسوڵمان چووە بەرەکانی جەنگەوە:-

بە بەڵگەی ئەوەی کە خوای گەورە لە سورەتی ئەنفال ئایەتی(٤٥)دا دەفەرموێت:

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُوا)

واتە:- ئەی ئەو کە سانەی باوەڕتان هێناوە کاتێک ڕووبەڕووی دەستەیەک دەبنە وە لە کاتی جیهاددا ئەوە خۆڕاگربن.

وە لە ئایەتی(١٥)ی هەمان سورەت دا دەفەرموێت:-

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا زَحْفاً فَلَا تُوَلُّوهُمُ الأَدْبَارَ )

واتە:- ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە ئەگەر لە کاتی جیهاد دا ڕووبە ڕووی بێباوەڕان بوونەوە ئەوە هەرگیز پشتیان تێمەکەن.

٢. ئەگەر دوژمن هێرشی هێنا بۆ سەر وڵاتێک لە وڵاتانی ئیسلام:-

ئەوە لەو کاتەدا پێویستە واتە دەبێتە فەرزی (عە ین) لەسەر هەموو خەڵکی ئەو وڵاتە بە پیاو و ئافرەت و گەورە و منداڵەوە، بەرهەڵستی دووژمنان بکەن، وە لەسەر مسوڵمانانی

**وولاتەکانی تریش واجب دەبێت کەوا بچنە یارمەتی دانی براکانیانەوە لە بەرەکانی جەنگ یان هەرکەسێک بەپێی توانای خۆی و بەپێی پێویست.**

**٣-وە ئەگەر پێشەوای مسوڵمانان داوا بکات لە مسوڵمانان کەوا ڕاپەڕن بۆ جیهاد:-**

**بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە کە إبن عباس (خوایان لێ ڕازیبێت )دەگێڕنەوە کەوا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت:-**

**(لاهجرة بعد الفتح ولكن جهاد ونية وإذا استنفرتم فانفروا)**

**رواه البخاري(٦/رقم/٢٧٨٣)ومسلم(٦/٩٨٦/١٣٥٣)**

**واتە:- دوای ڕزگارکردنی مەککە ئیتر کۆچ کردن نەما، بەڵکو جیهاد کردن و نییەت پاکیە، وە ئەگەر داواتان لێکرا کەوا ڕاپەڕن بۆ جیهاد ئەوە ڕاپەڕن.**

**کەواتە برای بەڕێزم دوای باس کردنی ئەم بەڵگانە بۆمان ڕوون بوویەوە کە وا ئەمڕۆکە چۆن کوفری جیهانی بەربوونەتە گیانی مسوڵمانان و ئەمان کوژن و تەعدای ناموس و شەرەفمان لێ دەکەن و خێرو بێری مسوڵمانان بۆ خۆیان دەبەن وە کۆمەڵە سەرکردەیەکی بە کرێگیراو زاڵمیان بۆ داناوین تاوەکو ئەوە کەسەی کە دەیەوێت دەنگی حەق بە گوێی میلەت دا بدات سەریان پان بکرێتە وە هەر بۆیە لەگەڵ داغل بوونی ئەمریکا بۆ عێراق ٢٦زانای بە ڕێز لە وولاتی حەرەمەین ڕاپۆرتێکیان ئیمزا کرد لەسەر فەرز بوونی جیهاد لەسەر مسوڵمانان. بەڵێ بێگوومان ئەمڕۆکە جیهاد فەرزی عەینە لەسەر هەموو مسوڵمانانی جیهان، بەلاّم نەک هەرکەس بۆ خۆی پێویستە مسوڵمانان هەوڵی ئەوە بدەن کە پاڵ بدەن بە سەرکردەیەکی ڕاستگۆو خواویستەوە کە هەوڵ بدات بۆ گێڕانەوەی حاکمییەتی خوای گەورە لە دەستی صەلیب وطاغووتان و زاڵمان و مورتە ددان بۆ حوکم کردن بە بەرنامەی خوای گەورە کە بەڕاستی ئەمە بردنەوەیە هەم لە دوونیا وە هەم لە دوارۆژیشدا.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**٧- من ٣٢ ساڵم وه هەست دەکەم کە ڕەگەزی نێرینەم زۆر بچوکە و هی ئەوە نیە کە منداڵ دروست بکەم، ئایا دەتوانم کە دەرمانی گەورە کردنی بۆ بەکار بهێنم.**

**وەڵام:**

## بسم الله الحمد لله الصلاة والسلام على رسول الله(صلى الله عليه وسلم) أمابعد:-

**سه رەتا برای بەڕێزم ئەبێت ئێمە بگەڕێینە وە بۆ لای ئەو خالقەی کە دروستی کردوین بە جوانترین شێواز لەوانەیە زۆرجار لە زمانی پزیشکەوە بێتە بەر گوێمان کەوا فلانە نەخۆشی چارەسەری نیە یان فلان کەس نەزۆکە و منداڵی نابێت کە بەڕاستی ئەم ووتانە هەڵەن کە بەکار دەهێنرێن ئێمە دەتوا نین بڵێین (( العلم عند الله )) واته:- زانیاری تەنیا لای خوای گەورەیە بە تایبەتی حاڵەتی منداڵ بوون برای بەڕێزم ئەگەر کەمێک بگەڕێینەوە بۆ قورئانی پیرۆز کەوا خوای پەروەردگار لەسەرزاری پێغەمبەر زەکەریا (علیه سلام) باسێکی تێرو تەسەلمان بۆ دەکات کە خۆی و خێزانەکەشی لە تەمەنی پیریدان، بەڵام کاتێک کە داوا لە خوای گەورە دەکات کەوا منداڵێکیان پێ ببەخشێت وە دەشزانێت کەوا خێزانەکەی منالی نابێت بەڵام واز ناهێنێت لەدوعا کردن وپاڕانەوە کە بەراستی ئەم بە سەرهاتە ووزە دەبەخشێت بەشوێن کەوتوانی محمد (صلى الله علیه وسلم) هەر بۆیە خوای گەورەش دوعاکەی گیراکردوو موژدەی یەحیای پێ دەبەخشێت بۆ زیاتر تێگەشتن لەم بەسەرهاتە دەتوانیت سەرەتای سورەتی مەریەم بخوێنیتەوە کەوا بە تێرو تەسەلی ئەم بەسەرهاتەی باس کردوە یان دەیان بەسەرهاتی تری لەو جۆرە کەوا سارەی خێزانی ئیبراهیمیش (علیه سلام) منالی نەدەبوو دوایش خوای گەورە إسحاق ی پێ بەخشی.**

**کەواتە برای بەڕێزم مەسەلەی تۆ هەر زۆر ئاسان ترە إن شاألله وە داواکارین لەخوای گەورە کەوا خێزانێکی ئیمانداری صالحة بکاتە نسیبت و وە لە پاشیشدا زوریەتی صاڵح وصاڵحەت بکاتە نسیب، بەڵام ئەوەی کەزۆر گرنگە وقورئان فێرمان دەکات نائومێد نەبوونە براگیان**

**هەروەک و چۆن زەکەریا (علیە سلام) نائومێد نەبوو لەو تەمەنە پیریەشدا کەواتە نابێت نائومێد بین لەڕەحمی خوای گەورە. وە بەنسبەتی پرسیارە کەشتەوە بەڵێ جائیزە دەتوانیت دەرمانی گەورە کردن بەکار بهێنیت بۆ زەکەرت بەومەرجەی دەرمانەکە زەرەرت لێ نەدات برای بەڕێزم.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**٨-بەڕێزان من تەمەنێکم بڕیوە و حەز بە ئافرەت ناکەم واتا ئارەزوی ژنهێنانم نیە و سروشتی خۆم وایە کە ئەو هەستەم نیە، ئایا ئەگەر ژن نەهێنم گوناهبار دەبم؟**

**وەڵام:**

## بسم الله الحمد لله الصلاة والسلام على رسول الله(صلى الله عليه وسلم) أمابعد:-

**سەرەتا دەبێت ئەوە بزانین کەوا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:-**

( يا معشر الشباب ، من استطاع منكم الباءة فليتزوج، فإنه أغض للبصر، وأحصن للفرج، ومن لم يستطع فعليه بالصوم ، فإنه له وجاء)

**رواه البخاری فتح رقم** 5066.

**واتە : ئەی چینی گەنجان هەرکەس لەئێوە توانای ژن هێنانی هەیە ئەوا با ژن بێنێت، چونکە ژن هێنان چاو دەگرێتەوە لە نەزەرکردن و قەڵایەکیشە عەورەت و دەپارێزێت، وە بۆ هەرکەس توانای ژن هێنانی نیە ئەوا با ڕۆژو بگرێت چونکە ڕۆژو دەبێتە پارێزەر بۆی.**

ئەگەر بەڕێزیشتان تواناتان هەیە ئەوە بەڕاستی زەرورە دروست کردنی خێزان ئەگەریش نا نەخێر

لە ڕووی شەرعەوە تاوانبار نابیت برا گیان چوونکە  زۆر لە  پیاو چاکان و زانایانی پێشین هە ن

ڕەحمەتی خوایان لێبێت خێزانیان نە  هێناوە وەک إبن تە  یمیە  و  سید قطب و  زەمەشخەری و

چەندەها زانای دیکەی بەڕێزی ئەم ئوممەتە  پیرۆزەی ئیسلام، کەسیش نەیوتوە کەوا تاوانبارن لە

سەرنە  هێنانی خێزان کە واتە  بۆ خۆت سە رپشکی لە  هێنانی خێزان دا برای بە  ڕێزم هە رچەندە

ئەگە ر خێزان بهێنیت  زۆر لە  بواری ژیانت گۆڕانکاری بە سەر دێت، چوونکە  هەندێک کە س پێیان

وایە  خێزان دروست کردن تە نیا بۆ ئارەزوو تێرکردنە  کە بەڕاستی ئەمە  بیرکردنەوەیەکی هە ڵەیە

چوونکە  ئەم ئارە زووە  تاسەر نیە   هەر بۆ چە ند ساڵێکی ئە وەڵی ژیا نە  دوای وردە  وردە  ئەم

ئارەزووەش دە ڕەوێتەوە،   چوونکە  پیاو پێویستی بە  وە  هەیە  گەر خوا بیکات بە   نسیبی لە

تەنیشت خێزانێکی  ئیماندارەدا بحەوێتەوە لە  دوایشدا خوای گە ورە  زوریەتی صالح یان صالحە ی

پێ ببە خشێت کەوا بتوانێت پە روەردەیەکی جوان پە روەردەیان بکات لە سەر رێبازی ڕاستی ئیسلام

لەدوای مردنیشی سوودیان هەبێت بۆ دایک و باوکەکەی إن شاألله  کە  ئەمەش سووننەتی حەیاتی

پێغەمبەران بووە (علیهم الصلاة والسلام).

**خوای گەورەش زاناترە.**

**٩ - مامۆستا ئایا ئافرەتێکی عاقڵ و باڵغ لەکاتی مارە کردنی لەکەسێک کەبەدڵی خۆیەتی و وەلی ئەمرەکە ڕازی نیە، ئایا دەکرێت بەبێ پرسی وەلی ئەمرەکەی شوبکات؟ ئایا ئەم عەقدە باتڵە یان دروستە؟**

**وەڵام:**

## بسم الله الحمد لله الصلاة والسلام على رسول الله(صلى الله عليه وسلم) أمابعد:-

**مەرجە کەوا بۆ ڕاستێتی دابەستنی مارە برین سەرپەرشتیاری ئافرەتەکە لەگەڵ دووشایەتدا ئامادەبن بۆ ئەم باسەش ئەم فەرموودەیە دەهێنینەوە بە بەڵگە کەوا عائیشەی دایکی ئیمانداران (ڕەزای خوای لێبێت) بۆمانی دەگێرێتە وە کەوا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:**

(أيما إمرأة لم ينكحها الولي، فنكاحها باطل، فنكاحهاباطل، فنكاحهاباطل، فإن أصابها، فلها مهرها بما أصاب منها فإن إشتجروا، فالسلطان ولي من لا ولي له)

**[رواه إبن ماجه(١/٦٠٥/١٨٧٩)وأبوداود(٦/٩٨/٢٠٩٨مع العون)والترمذي(٢/٢٨٠/١١٠٨)وهو صحيح، بڕوانە صحيح إبن ماجة(١٥٢٤)]**

**واتە:- هەر ئافرەتێک سەر پەرشتیارەکەی مارەی نەکات ئەوە مارەبڕینەکەی بەتاڵە، ئەوە مارەبڕینەکەی بەتاڵە، مارەبڕینەکەی بەتاڵە، ئەگەر چووە لای (جیماعی لەگەڵ دا کرد) ئەوە هەموو مارەییەکەی بەردەکەوێت، جا ئەگەر سەرپەرشتیارەکان دەمە قاڵەیان لەنێوان دا دروست بوو ئەوە دەسەڵات دار سەرپەرشتیاری کەسێکە کە سەرپەرشتیاری نەبێت.**

**وه له فەرموودەیەکی تردا کە هەر عائیشەی دایکی ئیمانداران بۆمانی دەگێڕیتەوە (ڕەزای خوای لێبێت) کەوا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیەوسلم)دەفەرموێت:**

**(لانكاح إلا بولي وشاهدي عدل)**

**[رواه البيهقي(١٢٥/٧)وإبن حبان(١٢٤٧/٣٠٥)وهو صحيح ،بڕوانه صحيح الجامع(٧٥٥٧)والأرواء(١٨٣٩)]**

**واتە:- مارەبڕین دانامەزرێت مەگەر بەئامادە بوونی سەرپەرشتیارو دووشایە تی دادپەروەر.**

**لە ڕووی ئەم دوو فەرموودەیەوە بۆمان ڕوون بوویەوە کەوا مارەییەکە دانامەزرێت وە عەقدەکە باتڵە کەواتە نەکرێت باشترە بەبێ ئاگاداری سەرپەرشتیار.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**١٠-لە پیزا شۆپ ئیش دەکەم و بەرازیشی تیایەو دیلیڤەری دەکەم بۆ ماڵان، ئایا حەرامە ؟**

**وەڵام:**

**بسم الله الحمد لله الصلاة والسلام على رسول الله(صلى الله عليه وسلم) أمابعد:-**

**خوای گەورە لە قورئان دا ئەوەی حەرامی کردووە بە جوانی ڕوونی کردۆتەوە لە سورەتی مائیدە ئایەتی (٣) کە بەرازیش یەکێکە لەو حەرام کراوانەوە کە دەفەرموێت:-**

(حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنزِيرِ.................)

**واتە :- حەرام کراوە لەسەرتان مردارەوە بوو وە خوێن وە گۆشتی بەراز.....**

**کەواتە مادەم گۆشتی بەراز حەرامە ئەبێت ئێمە خۆمانی لێ بەدور بگرین چوونکە ئیش کردنیش تێیدا حەرامە چ جای ئەوەی دلیڤەری بکەین و بەئامادە کراویش بیبەین بۆ خەڵکی خوای گەورە پەنامان بدات لەوانەیە زۆر جار خەڵکێک بڵێن خۆ ئێمە نایخۆین!**

**بەلاّم لە شەرعدا کەشتێک حەرام بوو مامەڵەی ۆوشتهش حەرامە خوا پەنامان بدات کەواتە برا گیان بزانە کە ڕسق لای خوای گەورەیە هەر ئەویش ڕسقمان دەدات وە پێشینان فەرموویانە سەری بێ ڕسق لە ژێر خاک دایە هەوڵ بدە ئیشەکەت بگۆڕیت، چوونکە ئیشەکەت حەلاّل نیە.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**١١. من کچێکی زۆر لەخوا ترسم نوێژ دەکەم و هەموو ساڵێک بەڕۆژوو دەبم بەلاّم ناتوانم حیجاب بکەم لە ترسی باوکم کە زۆر ڕقی لە لەچکە، ئایا گوناه بار دەبم؟**

**وەلاّم:**

بسم الله الرحمن الرحيم الحمدو لله الصلاة والسلام على رسول الله (صلى الله عليه وسلم )أما بعد:-

**سەرەتا خوای پەروەردگار سەر بەرزت بکات خوشکی بەڕێز وە خوای گەورە دڵی باوکیشت نەرم بکات کە ڕێگەتان لێ نەگرێت بێگومان گوێ ڕایەڵی کردنی دایک و باوک فەرمانی خوای پەروەردگارە لە پاش خواو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە گوێ ڕایەڵیان بکرێت، بەلاّم لە فەرمانێک کە سەرپێچی خواو پێغەمبەری خوای تێدا نەبێت وە مەسەلەی لەچک کردنی فەرمان دە کات بە ئافرەتان فەرمانی خوای گەورەیە کە لە ئایەتی٥٩ی (سورەتی ئەحزاب) ئافرەتانی ئیماندار کە سەریان داپۆشن و جوانیەکانی خۆیان دەرنەخەن کەواتە فەرمانی خوای گەورە لە پێش فەرمانی باوکەوەیە با ڕقیشی لە لەچک بێت، نابێت بەقسەی بکەیت خوشکی بەڕێزم سەرەتا هەوڵ بدە بەقسەی خۆش یان لەڕێی کەسێکەوە کە باوکت خۆشی بوێت پێی بڵێ ئەگەر هەر ڕازی نەبوو ئەوە کات بەقسەی مەکە با لە پێناوی خوای گەورەشدا ئازار بدرێیت مادەم**

**تۆ زۆر لە خواترسی نابێت ترسی باوکت بخەیتە پێش ترسی خوای گەورەوە خوای گەورە یارمەتیت بدات دادەی بەڕێزم.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**١٢-مامۆستای بەڕێز تا چەندێک دەتوانی غوسڵ دەرکردن تاخیر بکەیت؟**

**وەڵام:**

## بسم الله الرحمن الرحيم الحمدو لله الصلاة والسلام على رسول الله (صلى الله عليه وسلم )أما بعد:-

**غوسڵ دەرکردن واجبێکە لە واجباتەکانی ئیسلام کە پێویستە ئینسانێ مسوڵمان لەو کاتانەی کە توشی لەش گرانی دەبێت یان کاتێک کە جیماع دەکات یان هتد........غوسڵی خۆی دەر بکات ئەوەی کە زۆر گرنگە لێرەدا باسی بکەین ئەوەیە کە نابێت ئینسانی مسوڵمان کە غوسڵی لەسەر بێت نوێژ بکات تا خۆی نەشوات واتە تا غوسڵ دەرنەکات لە لەشی، مەگەر عوزری شەرعی هەبێت وەک ئەوەی کە ئاوی دەست نەکەوێت ئەوکات تەیەموم دەکات وە ئەگەر بەڕێزت توشی حاڵەتێک بویت لەو حاڵەتانەی کە پێویستە غوسڵ دەربکەیت بۆ نمونە لە دوای نوێژی بەیانی توشی لەش گرانی دەبیت ئەوا دەتوانی تا کاتی نوێژی نیوەڕۆ خۆت نەشۆیت واتە مادەم نوێژی بەیانیت کردوە ئەوا دەتوانیت بەو شێوەیە بمێنیتەوە تا کاتی نوێژێکی کەت کەواتە هە ندێک لە زانایان دەڵێن دەتوانیت بە لەشی گرانەوە بمێنیتەوە بەو مەرجەی نوێژی فەرزت لەدەست**

**نەدەیت كە ئەمەیان لە پێش ترە، بەڵام هەندێك لە زانایان پێیان باش نیە مانەوەی زۆر بەلەش گرانی.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**١٣-ئەگەر زانیاریمان نەبێت دەربارەی بنەماكانی ئیسلام، چۆن بتوانین ئیمانمان بەهێز بكەین ؟**

**وەڵام:**

بسم الله الرحمن الرحيم الحمدو لله الصلاة والسلام على رسول الله (صلى الله عليه وسلم )أما بعد:-

**بنەماكانی ئیسلام وەك ئەوە وایە كە كەسێك خانویەك دروست بكات بنچینە كەی بكاتە بەرد، چوونكە هەر كات بنچینە پتەو بوو لەدوایدا ترسی ڕوخانی كەمە دەتوانرێت ١٠ قاتی كەشی لەسەر دروست بكرێت. كابرای خاوەن ماڵ بێ ترسە چونكە دەڵێت بنچینەكەیم بە بەرد داناوە هەر بۆیە ئەم ئیسلامە شیرینەش بەم شێوەیە ئەگەر سەرەتا زانیمان ئیمان و ئیسلام چین لە ڕوی زمانەوانی و شەرعیەوە وە باوەڕی تەواومان هەبێت بە هەموو ئەو فەرمان و نەهیانەی كە خواو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) داوامان لێ دەكەن بە كردن و نە كردنیان ئەوا بنچینەمان ترسی نیەو، لەدوای ئەم شتانەوە دەست دەكەین بە فێربونی عیلمی شەرعی ئەوكات دەچینە قۆناغی بەهێزی ئیمانەوە ئەویش لە قورئان و سوننەتەوە سەرچاوە دەگرێت بەڕوون كردنەوە یان لەلایەن زانایانی ئەهلی سیقەو بەڕێزەوە كە گوێ لە ووتارەكانیان بگرین قورئان زۆر بخوێنین، چوونكە قورئان خوێندن بە تێگەشتن لە ماناكانی و پە یرەوكردنی بە كردەوە ئیمان بەهێز دەكات وە چیرۆكی پەند ئامێز و ژیاننامەی پێغەمبەران و چەندە هاشتی كەی ئەم ئیسلامە شیرینە كە ئینسان ئاوێتەی خۆی دەكات و قەت تێری لێ ناخوات.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

١٤- من بەڕاستی کاتی خۆی لەسەر ٥٠٠ مسقاڵ ئاڵتوون مارەکراوم و تەمەنم ١٨ ساڵ بوو هیچم نەزانیوە ئێستا تەمەنم نزیکەی ٤٠ ساڵەو دوو ساڵە مێردەکەم تەلاقی داوم، وە هەرگیز ئەو ٥٠٠ هەر نازانم چیشن، ئایا زەکاتم لەسەرە؟ چونکە من یەک مسقاڵیشم مسقاڵ زێڕم نەدیوە و بەچاوی خۆم نەدیوە.

**وەڵام:**

## بسم الله الحمد لله الصلاة والسلام على رسول الله(صلى الله عليه وسلم) أما بعد:-

زەکات لە شتێک دەردەکرێت کەوا لە بەردە ست دابێت و ساڵێکیش بە سەریدا تێپەڕیبێت، بەڵام ئەوەی کە بەڕێزتان باسی دەکەن تەنیا نوسراوی سەر کاغەزە واتە بەکردەوە بۆت نەکراوە ئیتر زەکات لەچی دەربکەیت خووشکی بەڕێز کە تۆ ١ مسقاڵیشت نەبینیبێت لەلایەکی تریشەوە بەڕێزتان ئیشارە تتان بەوە داوە کەنەتان زانیوە کەواتە تۆ تاوان بارنیت، چوونکە لەلای خوای گەورە نەزان قەڵەمی لەسەر نیە بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە لەلایەن (أبوذري الغفاري)ە وە ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:-

(إن الله تجاوز عن أمتي الخطأ والنسيان وما استكرهوا عليه)

[رواه إبن ماجه (٢٠٤٣/١)والطبراني وغيره بألفاظ مختلفه وهو حديث صحيح بڕوانە صحيح سنن إبن ماجه(١٦٦٢)وصحيح الجامع(٣٥١٥)والأرواء(٨٢)]

واتە:- بەڕاستی خوای گەورە تاوانی هەڵگرتوە لەسەر ئوممەتەکەم لە هەڵە کردن و بیرچوونەوە و ئەوەیشی کە زۆریان لێدەکرێت.

بەڵام بێگوومان هاوسەرت لەسەر ئەم کارە تاوانبارە لە دوو ڕێگەوە یەکێکیان نەکردنی ئەو بڕە ئاڵتوونەی کە لەمارەییدا بڕیاری لەسەر داوە کەحەقی شەرعی تۆیە، وە دووەمیشیان گوێ نەدانە شەرعی خوای گەورە لە دانی زەکات دا لەو ماوە زۆرەی کە هاوسەرت بووە.

**خوای گەورەش زاناترە.**

**١٥-ئەگەر یەکێک لە کارگەیەکدا ئیش بکات و جۆرەها گۆشتی تیابێت ئایا ئەگەر تەنها گۆشتەکان لە شوێنێک بگوازێتەوە بۆ شوێنێکی تر و گۆشتی بەرازیشی تیابێت، ئایا گوناهبار دەبێت؟**

**وەڵام:-**

## بسم الله الرحمن الرحيم الحمدو لله الصلاة والسلام على رسول الله (صلى الله عليه وسلم )أما بعد:-

**بەڵێ بێگومان تاوان بار دەبێت بەگواستنەوەی گۆشتی بەرازەکە وە ئەگەر گۆشتەکانی کەش سەر نەبوڕدرێن بەکارەبا بکوژرێن یان بیان خنکێنن ئەوا ئەویش حەرامە، بەڵام ئەگەر سەر بڕاوبون ئەوە تە نیا پارەی گۆشتی بەرازە کەت حەرامە ئەویش دەتوانیت کاتەکەی حساب بکەیت و بزانیت پارەکەی چەندە جیای بکەوە بیدە بە سابون یان کفنی مردوو یان ئەشیای تەوالێتی مزگەوت یان هە ندێک شتی کە وە ئەم پارەیە بۆ خێر بە کار نایەت گەر پێت وا بێت بیکەیت بەخێر، چونکە خوای گەورە پاکە و پاکیش وەردەگرێت.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**١٦-ئەگەر ژنێک وا بکات کە مێردەکەی هەموو شتێکی بەقسە بکات و لە ژێر سەمع و تاعەی ژنەکەیدا بێت و ئەم ژنە وا بکات کە مێردەکەی چۆن بوێت ئاوا بکات و هەر داوایەکی لێ کرد مێردەکەی بۆی بکات، هەتا ئەگەر داواکە شەرعیش نەبێت و بۆ ئەمەش ژنەکە تا مێردەکەی لە قسەی دەرنەچێت خۆی دەتۆرێنێت و منداڵی شیرە خۆرە بەجێ بهێڵێت بۆ مێردەکەی تا لە قسەی دەرنەچێت و داوای تەڵەقیش نەکات، وەهەر کات مێردەکەی ووتی تەڵاقت ئەدەم ژنەکە داوای ١٠٠٠ لیرەکەی بکات کە مارەیی لەسەر دامەزراوە، وە ئەم ١٠٠٠ لیرەیە بۆیە داوام کردووە تا نەتوانێت تەلاقم بدات، چونکە ئەزانم کە مێردەکەم ناتوانێت بچێتە ژێر باری ئەو ١٠٠٠ لیرەیە، ئایا من حوکمم چیە کە ئاوام لەگەڵ مێردەکەم؟ وە من ساڵی دوو سێ جار دەتۆرێم و یەکێک لە**

یەکێکیشیان منداڵەکانم بەجێی دێڵم بۆ مێردەکەم کە شیرە خۆرەیەو وە ئەو شتانەش کە نوقسانە، مەلا بە مێردەکەمی ووتووە کە ئەو و داوای دەکەم ناشەرعین؟ تکایە وەڵام

**وەڵام:**

**بسم الله الرحمن الرحيم الحمدو لله الصلاة والسلام على رسول الله (صلى الله عليه وسلم )أما بعد:-**

بێگومان خوشکی بەڕێزم سەرەتا ئەبێت ئەوە بزانین کە خوای گەورە ئەم دونیایەی دروست کردووە بۆ ئەوەی تاقیمان بکاتەوە بزانێت کاممان کردەوەی چاک ئەنجام دەدەین وە لەم دو نیایەدا کچ و کوڕی بۆیە دروست کردوە تاوەکو ژیانی هاوبەش پێک بهێنن و زوریەتی باش بخەنەوە کەمێک خۆشی ببینن لەم دونیا کلتیەدا وە نابێت کەسیان لەسەر ناشەرعی هانی ئەوەی کەیان بدات وە ئەو مارەکردنەی کە خوای گەورە بۆ ئافرەتی داناوە مافێکی شەرعی خۆیەتی هەر چەندی بۆ کرا بێت لەلایەن پیاوەکەیەوە، بەڵام ناشبێت ئافرەت لە بەر مەرامی خۆی هەر کات حەزی لە ناشەرعیەک بێت پیاوەکەی بەگوێی نەکات ئەمیش بە هەلی بزانێت بیکاتە کارتێکی فشار بەسەر پیاوەکەیەوە بێگومان لای خوای گەورە تاوانبار دەبێت وە پاشان ئەگەر خاوەنی مناڵیش بێت ئەبێت خەم بۆ دوارۆژی مناڵەکانی بخوات نەک خەم بۆ کارێک بخوات کە سور بزانێت ناشەرعیە، بەڵام بەلایەوە سادە بێت ئەوجا خوشکی بەڕێزم مادەم هاوسەریشت پرسیاری کردوە لە مەلا و فەرمویە تی ناشەرعیە دڵنیا بە پرسیار لە هەر کەسێکی ئەم ئیسلامە بکەیت هەروات پێ دەڵێت چوونکە کەس ناتوانێت لە غەیری خواو پێغەمبەری خوا حەلاڵێک حەرام بکات یان بە پێچەوانەوە لە کۆتایدا دەڵێم سەر لە خۆشت و ماڵ و منداڵەکەت مەشێوێنە چوونکە دوایی هەر خۆت پەشیمان دەبیەوە دادە گیان.

**خوای گەورەش زاناترە.**

**١٧-بەڕێزان من هاوڕێیەکم هەیە کچێکی زۆر ملتەزیم و موسڵمانە، بەڵام نەزری کردووە کە شوو نەکات بە هیچ کەسێک کە حافض قورئان نەبێت، وە تا ئێستا چەندین کەس هاتونەتە خوازبێنی بەڵام هەر لەسەر نەزرەکەی خۆی سوورە، ئایا ئەمە گوناهبار نابێت کە شوو ناکات؟**

**وەڵام:**

## بسم الله الرحمن الرحيم الحمدو لله الصلاة والسلام على رسول الله (صلى الله عليه وسلم )أما بعد:-

**بە نسبەتی ئەو خوشکە بەڕێزەوە کە ئەو نەزرەی کردوە دیارە لە ڕوی ئیمانیەوەیەتی کە ئەم داوایە دەکات وە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليەوسلم) داوامان لی دەکات کەوا پابەند بین بە نەزرەکانمانەوە، بەڵام زۆر جار کارێک دەکەین پێمان وایە شەرعیە بەڵام ئەگەر ئاورێک بدەینەوە لە قورئان وسوننەت بە هیچ شێوەیەک باسیان نەکردوە تا ئێستا نەمان بیستوە کە ئافرەتێکی صەحابە بەم شێوەی کرد بێت کەواتە نابێت ئەو هاورێ بەڕێزەت ئەوجۆرە نەزرانە بکات، چونکە حافضی قورئانی شه رت نیە کە ئەو کەسە بکاتە کەسێکی بیرو باوەڕ پاک زۆر جار حافض قورئانی وا هەیە تەنیا بۆ تیجارەت قورئان لە بەر دەکات وەک هە ندێک لە مەلا کوێرەکانی مزگەوتی گەورەی سلێمانی کە چۆن قورئانیان کردۆتە تیجارەت خوا پەنامان بدات، ئەتوانێت نەزر بکات کەوا شو بکات بە کوڕێک کەوا ئیماندارێکی مولتەزیم بێت ئەمەیان کارێکی پەسەندە، وە ئەگەر ئێمە ئاورێک لە مێژووی هاوەڵان بدەینەوە ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێبێت عبداللەی کوڕی مەسعود لە ماوەی ١٠ ساڵ دا سورەتی بەقەرەی لەبەر کردوە، بەڵام بە جۆرێک کە تێگەشتنی لە هەموو ئایەتە جوانەکانی هەبووە کاتی دابەزاندنەکانی و ژمارەی ئەو هاوەڵانەی کە لەو کاتەی دا بەزیوە و بۆ چیش دا بەزیوە، بەڵام ئێستا ٦٠٠ هە زار کەس لە پاکستان حافض قورئانن بەڵام بە داخەوە کەم لە مانە عەقیدە پاکن کەواتە بەو خوشکە بەڕێزە بڵێن نەزر لە سەر شتێک نەکات کە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نەبێت.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**١٨-ئایا شەوی بەرات لە قورئاندا باس کراوە؟ بۆ هەندێک لە موسڵمانانی جیهان ئەو یادە ناکەن، لە کاتێکدا لە کوردستان دەکرێت؟**

**وەڵام:**

## بسم الله الرحمن الرحيم الحمدو لله الصلاة والسلام على رسول الله (صلى الله عليه وسلم )أما بعد:-

**بەنسبەتی شەوی بەرات کەدەکاتە شەوی ١٥ ی شەعبان منالآن لەو شەوەدا دەگەڕێن نقوڵ و چکلێت کۆ دەکەنەوە بێگومان لەکوردستان ئەم یادە هەموو ساڵێک دەکرێتەوە، بەلآم ئەوەی ڕاست بێت  ئەسڵی نیە لە شەرعدا بیدعەیە کە لە ناومیللەتی ئێمەدا دروست بووە کە ئێستا بەداخەوە میللەتی ئێمە زۆر بە ی زۆری وازیان لە فەرز هێناوە، بەلآم بۆ زیندوکردنەوەی بیدعە زۆر دەست پێش خەرن، وە بە نسبەتی ئەوەی هەندێک لە مسوڵمانانی جیهان  بۆ ئەو یادە ناکەن؟ بێگومان نەبووە ئەگەر ببوایە ئەوا هەموو مسووڵمانانی جیهان وەک جەژنی ڕە مەزان و قوربان یادیان دەکردەوە وە پێغەمبەری خوا نەهی دەکات لەغەیری ئەم دوو جەژنە، کەواتە مسووڵمان تەنیا ئەو دوو جەژنەی هەیە.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**١٩-ئـايا گۆرانی حەرامە؟**

**وەلآم:**

## بسم الله الرحمن الرحيم الحمدو لله الصلاة والسلام على رسول الله (صلى الله عليه وسلم )أما بعد:-

**بێگومان ئەگەر شتێک پێی بوترێت گۆرانی هەڵبەتە ئەگەر گۆرانیەکە بە سەر ئافرەتیشدا نەبێت یان کوفریشی تێدا نەبێت، مادەم پێی دەوترێت گۆرانی بە مۆسیقاوە لێ دەدرێت کەواتە ئەگەر مۆسیقای لەگەڵدا بێت ئەوە خوا پەنامان بدات حەرامە گوێ گرتن لێی بەڵگەشمان بۆ ئەمە فەرمووده‌یەکە کە أبي مالک ڕەزای خوای لێبێت بۆمانی دە گێڕێتەوە کە  پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه‌وسلم)  دەفەرموێت لە ئو ممەتەکەم کۆمەڵانێک پەیدادە بن زیناکردن و ئاوریشم پۆشین و**

مەی خواردنەوە و ئامێری مۆسیقا ژەندن بە حەڵاڵ دەزانن. خوا پەنەمان بدات بەڕاستی ئەم فەرمودە پیرۆزە ئەمڕۆ کەزۆر بەجوانی وەکو گزنگی بەری بەیان ڕویداوە کە کۆمەڵێک لەسرووود بێژە ئیسلامیەکانیش ئەمڕۆکە مۆسیقا بە حەرام نازانن یان هەندێکی کەیان دەڵێن حەرامە بەڵام دەڵێن ئاخر کاکی برا ئەمڕۆ ئەو هەموو گۆرانیە فاسدە هەیە ئەگەر ئێمە وا نەکەین ئەوا خەڵک گوێ لە گۆرانی خراپ دەگرێت کەچی بەم شێوەیەش نەمان بینی گۆرانی بێژێکی فاسد بێتەسەر ڕیگەی ڕاست بە پێچەوانەوە ئەوا نەی ئێمە بوونەتە لاسایی کەرەوەی ئەوان لەسرووود وتنەوە گۆڕیان بۆ گۆرانی تەنانەت لە ئاوازەکانیشیان دا چاولەوان دەکەن پێشیان وایە بەم شێوەیە خزمەت بە ئاینی ئیسلام دەکەن، بەڵام بەپێچەوانەوە ئیسلام نەهی لەم کارە دەکات و بەتاوانی گەورەش لەقەڵە می دەدات خوا پەنامان بدات کەواتە حەرا مە ئەگەر بەم شێوەیە بوو.

**خوای گەورەش زاناترە.**

**٢٠-کاتێک ژن و مێرد جیماع دەکەن دەتوانن پەنجە بەرن بۆ کۆمی یەکتری؟ واتا پەنجە بەریتە ناویەوە؟**

**وەڵام:**

## بسم الله الرحمن الرحيم الحمدو لله الصلاة والسلام على رسول الله (صلى الله عليه وسلم )أما بعد:-

بەنسبەتی ئەم پرسیارەوە بێگومان خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت خێزانەکانتان وەک کێڵگەیەک وان کە لەگەڵیاندا ڕابوێرین بە هەر شێوازێک بێت بێجگە لە ڕووی دواوە واتە کۆمی کە ئەمە حەرام کراوە لەسە رمان، وە لەکاتی جیماع کردندا دەست بکەیتە کۆمیەوە ئەوە ناگە یەنێت کە زەکەرت داخڵ کرد بێت وە هیچ دەقێکیش نیە لە سەری کەوا ئەم کارەی حەرام کرد بێت، بەڵام خوا پەناما ن بدات ئەم کارە وا دەکات کە لە پاشدا ڕێگە بۆ حەرام خۆش بکەن

به ڕێز گیان کەواتە باش نیە ئەم کارە بکرێت وە کۆم جێگای پاشە ڕۆیە و میکرۆبی تێدایە وە شوێنێکی پیسیشە بۆیە دەبێت خۆمانی لی بە دوور بگرین .

خوای گەورەش زاناترە.

٢١-ئایا دۆعای دوای قامەت سوننەتە یان بیدعەیە؟

وەلام:

## بسم الله الرحمن الرحيم الحمدو لله الصلاة والسلام على رسول الله (صلى الله عليه وسلم )أما بعد:-

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت هەر کەسێک لە دوای بانگ ئەم دوعایە بخوێنێت (اللهم رب هذه دعوة التامة ...............) ئەوا بەر شەفاعەتی من دەکەوێت لە ڕۆژی قیامەتدا، بەڵام ئەوەی کە جێی سەرسوڕمانە ئەمڕۆکە لە زۆربەی مزگەوتەکانی کوردستان کاتێک کە قامەت دەکرێت لە پاش دا دەست بەرز دەکەنەوە و ئەم دوعایە دەخوێنن کە بە ڕاستی ئەمە بۆ خۆی زیادە ڕەویە لە شەرعدا پەنا بە خوا هیچ دەقێکی لە سەر نەهاتوە کە واتە بیدعەیە، وە ئەوەی کە لە فەرموودەکەدا هاتبێت سوننەتە لە دوای بانگ بخوێنرێت نەک دوای قامەت بەڵام لە کاتی قامەت کردندا بۆ خۆت دەتوانی لە دڵی خۆت دا دوعا بکەیت نەک بە دەنگی بەرز ئیتر هەر دو عایەک بێت.

خوای گەورەش زاناترە.

٢٢- من لە ئەورووپام و مەعاش خۆم و سێ منداڵم هەیە، جار جار پارە دەنێرمەوە بۆ ماڵی باوکم و مێردەکەم پێی خۆش نیەو دەڵێت ئەوان پێویستیان بە پارەی تۆ نیە، مەعاشی خۆمە، وە دەڵێت نابێت بینێریت، ئایا گوناە باردەبم بە دزیەوە بۆیان بنێرمەوە؟ چونکە پارەی خۆمەو خۆم پەیدای دەکەم.

وەلام:

## بسم الله الرحمن الرحيم الحمدو لله الصلاة والسلام على رسول الله (صلى الله عليه وسلم )أما بعد:-

**بێگومان ئەو پارەیەی کە حەقی خۆتە و خۆت پەیدای دەکەیت مەگەر خۆتان لەسەر بەشێکی رێک کەوتبن لەگەڵ هاوسەرتدا ئەگینا هیچ پەیوەندیەکی نیە بە هاوسەرتەوە مافی خۆتە چۆن بە کاری دەهێنیت وە هاوسەریشت بۆی نیە رێگەت لێ بگرێت یان بە هی خۆی بزانێت سەرەتا ئاگاداری بکەوە کە لە روی شەرعەوە هیچ حەقێکی ناکەوێت لەو پارەیە ئەگەر هەر رازی نەبوو ئەو کات خۆت سەرپشکی چۆنی بەکاردێنیت .**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**٢٣- کچەکەم مارە کراوە و کورەکە ووتی بە کچەکەم ئاساییە پێش ئەووی بچینە ماڵی خۆمان بتگوازمەوە، یانی لەگەڵی بخەوێت، وە ئێستا لە ماڵی منن و کچەکەم ژنێتی، ئایا ئەمە ئەبێت؟**

**وەڵام:**

## بسم الله الرحمن الرحيم الحمدو لله الصلاة والسلام على رسول الله (صلى الله عليه وسلم )أما بعد:-

**بە نسبەتی پرسیاری ئەم خوشکە بەرێزە وە بەڵێ مادەم کچەکەت مارە کراوە لە کورەکە ئەوا دەبێتە خێزانی و حەڵاڵی خۆیەتی کە بچێتە لای با نەشی گواستبێتەوە، چونکە مەسەلەی گواستنەوە تەنیا شتێکی عورفی و عادەتیە هیچ ئەسڵێکی نیە لە شەرعدا ئەووی کە چوونە لای یەکی ژن و پیاو حەڵاڵ دەکات مارە کردنێتی لە رووی شەرعەوە ئەتوانێت لە دوای مارە کردن بچێتە لای، وە بەڵێ دەبێت با لە ماڵی تۆش بن.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**٢٤- من لە زانکۆ حەزم لە کچێکی موسڵمانەو حیجاب دەکات و وەعدام داوەتێ کە بیهێنم، بەڵام ئەم کچە شتی تەسک لەبەر دەکات، ئایا ئەگەر نەیهێنم بێ وەعد دەرناچم؟ واتا وازی لێ بهێنم لە سەر ئەم جلە تەسکانە؟**

**وەڵام:**

## بسم الله الرحمن الرحيم الحمدو لله الصلاة والسلام على رسول الله (صلى الله عليه وسلم )أما بعد:-

**برای بەڕێزم سەرەتا دەبێت ئەوە بزانین کەوا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليهوسلم) دەفەرموێت ئافرەتان لەسەر دینی پیاوەکانیانن، بەڕێزیشتان هێشتا ئەم ئافرەتە نەبۆتە خێزانتان ئەتوانێت مەسەلەی جل و بەرگ لە کاتی مەرج دانان دا باس بکرێت مادەم لەسەر قسەی بەڕێزتان کە دەڵێن ئافرەتە کە مسوڵمانە و حیجاب دەکات بێگومان ئەگەر بەڵگەی شەرعی بۆ باس بکرێت دێتەوە سەر سکە إن شا ألله، چونکە ئەمڕۆکە ئەوەندە وە سیلەی فەساد زۆرە لە ڕێگەی ڕاگەیاندن و برادەری خراپ و چەندەها شێواز کە مسوڵمانان لەڕێ دەربکەن خوا پەنامان بدات مسوڵمانانیش بە شێکی زۆری لایان داوە لە ڕاستە ڕێی ئیسلام، برای بەڕێزم دەبێت پەیوە ست بیت بەووەعدە کەتەوە، بەڵکو بگۆڕێت إن شاألله چونکە جل و بەرگی تەسک تەنیا تاوانە ئینسان لە دین دەرناکات تا وەکو بڵێین ئەم پەیمانەی بەڕێزتان دا نامەزرێت لەسەر ناشەرعی ئەگەر هەر نکۆڵی کرد ئەو کات پێی بڵێ ئە گەر لە ئێستاوە ڕێک نەکەوین لە دوایشدا کێشەکانمان زیاتر دەبن و ژیانمان خۆش نابێت وە تۆش نەرم بەلەگەڵیدا برا گیان بە حیکمەتەوە ئا مۆژگاری بکە خوای گەورە هیدایەتی هەمووومان بدات. اللهم امين.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**٢٥- ماوەیەک پێش ئێستا شەرمان بوو لەگەڵ کوڕێک، ئەویش چەقۆی لێ دام، وە بە پێی یاسا بۆم هەیە کە داوای پارە بکەم، ئایا ئەم پارەیە کە داوای دەکەم حەقی خۆمە یان حەرامە؟**

**وەڵام:**

## بسم الله الرحمن الرحيم الحمدو لله الصلاة والسلام على رسول الله (صلى الله عليه وسلم )أما بعد:-

**بەڵێ بۆت هەیە داوای حەقی خۆتی لێ بکەیت لە ڕووی شەرعەوە، وە نەخێر هیچ حەرام نیە و حەقی خۆشتانە بەڵام ئەوەش بزانە ئەگەر کابرا پەشیمان بوو لەوکارەی کە کردویەتی ئەگەر لێی خۆش ببیت باشترە چونکە یەکێک لە سیفەتی خوای گەورە لێبوردنەوە ئەگەر لەبەر خوای گەورە لێی خۆش ببیت ئەوا پاداشتی خۆت وەردەگریت لای خوای گەورە وبێگومان چاکەت وون نابێت.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**٢٦-پیاوێک زۆر موتەدەیینە و موسڵمانە بەڵام ماڵە هاوڕێیەکی هەیە کە ژنەکەی لەچک ناکات و زوو زووش دەچێت بۆ ماڵیان، ئایا ئەم پیاوە موسڵمانە گوناهبار نابێت کە زوو زوو دەچێت بۆ ئەو ماڵە کە ژنەکەی لەچک ناکات؟ چونکە زۆر برادەری گیانی بەگیانین.**

**وەڵام:**

## بسم الله الرحمن الرحيم الحمدو لله الصلاة والسلام على رسول الله (صلى الله عليه وسلم )أما بعد:-

**کە سەردانی کەسێک چەند جۆرێک سەردان کردنمان هەیە بۆ نموونە هەندێک جار مسوڵمان دەکات تاوەکو بانگەوازی بکات بۆ ئیسلام ئەمەیان کارێکی زۆر باشە ئەگەر بزانیت بەرامبەرەکەت سود وەردەگرێت، وە هەندێک جار سەردانە کەمەصڵەحەتاویە بێگومان ئەم**

**سەردانەش تا سەر نابێت چوونکە لەسەر ئەساسێکی پاک دانەمەزراوە خوا پەنامان بدات وە سەردانی ئەم برایەش کە مولتەزیمە ئەگەر لەسەر یەکێک بێت لەم دوانە ئەوا وەلآمە کەیمان داوە تەوە لە سەرەوە وە ئەبێت باش ئاگاداریش بین لە ئیسلامدا برادەری گیانی بە گیانی دەردت چارەسەر ناکات لەدوارۆژدا وە تێکەڵی و سەردان کردنی خێزانێک کەوا وا جباتی خوا جێبەجێ نەکەن کە سی بەرامبەر لە دونیاو قیامەتیشدا زەرەرمەند دەکات ئەمە بەنسبەتی ئەو برا مولتەزیمە دەبێت خۆی بپارێزێت لە تێکەڵی نامەحرەم، بەلآم ئەگەر ئافرەتەکە لەچک نەکات واجباتەکانی کە جێ بەجێ بکات، بەلآم بلێت ئەزانم تاوانبار دەبم لەسەر لەچک نەکردن ئەوا تەنیا سزا دەدرێت لەسەری لە دوا ڕۆژدا بەلآم خوا پەنامان بدات بلێت هەر قەناعەتم پێی نیە ئەوە لە دینی ئیسلام دەردەچێت.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**منداڵیشم، ٢٧- من زۆر گوناهم کردووەو زیناو داوێن پیسیسم کردووە لە کاتێکدا خاوەنی ژن و پرسیارەکەم ئەوەیە کە ئایا ئەبێت خوا لێم خۆش بێت کە من لە خوا بەزیاد بێت لە مانگی ڕەمەزانەوە تەوبەم کردووە گەڕاومەتەوە؟**

**وەلآم:**

## الحمد لله الصلاة والسلام على رسول الله(صلى الله عليه وسلم) أما بعـد:-

**سەرەتا سوپاسی خوای گەورە دەکەین بە گەڕانەوەی بەرێزتان لەرێگەی گومڕاییەوە بۆ ڕێگەی هیدایەت بێگومان برای بەڕێزم خوای پەروەردگار دەرگای تەوبەی لەسەر پشتە تاوەکو تاوانباران**

**ئەویش زۆر بە میهرەبانیەوە پێشوازی دەکات لەبەندە تاوانبارەکانی وەک لە بگەڕێنەوە بۆ لای قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:-**

**(وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا ثُمَّ اهْتَدَى)** (سورة طه-٨٢)

**واتە :- وە بەڕاستی من زۆر لێبوردەم لەو کەسەی تەوبەی کرد بێت و باوەڕی هێنابێت و کردەوەی چاکی کرد بێت پاشان بەردەوام بێت لەسەر ئەو ڕێبازە. کەواتە بۆمان ڕون بویەوە کە خوای گەورە لە تاوان خۆش دەبێت با ماڵ و منداڵیشت هەبوبێت ئێمە نەوەی ئادەمین ئادەمیش هەڵەی کردوە سەلامی خوای لێبێت خۆ ئێمە فریشتە نین تاوەکو هەڵە نەکەین وە ئەگەر هەڵە نەکەین و زوو نەگەڕێینەوە بۆ لای خوا ئەوا ئەو کاتە خوای گەورە کۆمەڵێکی کە دروست دەکات لەسەر ئەم زەوییە کە هەڵە بکەن و زوو بگەڕێنەوە بۆ لای خوای گەورە بەڕێزیشتان مادەم تەوبەتان کردوە إن شا ألله بە دڵنیاییەوە خوای گەورە لێتان خۆش دەبێت بەومەرجەی بەردەوام بیت لەسەر ڕێبازی ئیسلام و نەگەڕێیتەوە سەر تاوان وە ئەم مەسەلەیەش ئەوەندە مەهێنە خەیاڵی خۆت چونکە زۆرجار دەتەوێت نوێژ بکەیت شەیطان دێتە خەیاڵت و دەڵێت نوێژ دەکەیت کورە بابە تۆ تا دوێنێ بوو زینات دەکرد بەخوا بەس لێت خۆش نابێت وە هەوڵ بدە تاوانەکەت کە تەوبەت لەسەر کردوە باس نەکەیت تەنیا لەنێوان خوای گەورە و خۆتدا بمێنێتەوە.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**٢٨-ئایا کە ژنم مارە کرد نێوانمان هەموو حەرامەکانی حەڵاڵ دەبن؟ لەگەڵ ڕەچاوی عادەت و تەقالید؟**

**وەڵام:**

**الحمد لله الصلاة والسلام على رسول الله(صلى الله عليه وسلم) أما بعـد:-**

**بەڵێ بێگومان هەموو حەرامەکانی نێوان ژن و پیاو حەلاڵ دەبێت وە دەتوانن چێژ لە یەکتری ببینن بەو مەرجەی هەستی یەکتری بریندار نەکەن وە مەرج نیە ڕەچاوی عادەت و تەقالید بکرێت مادەم لە ئەسڵ دا حەلاڵە ئیتر هیچ کێشەیەک دروست ناکات بۆ ئیماندار وە بوا گیان دەبێت هەوڵ بدەین دینمان زاڵ بێت بە سەر عورف و عادەتمان نەک عورف و عادەتمان زاڵ بێت بە سەر دینمان دا.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**٢٩-ئایا مارەیی دادەمەزرێت ئەگەر یەکێک لە بووک یان زاوا نوێژ نەکەن؟**

**وەڵام:**

## الحمد لله الصلاة والسلام على رسول الله(صلى الله عليه وسلم) أما بعـد:-

**ئەم مەسەلەیە خیلافی لەسەرە لەلایەن زانایانی بەڕێزەوە هە ندێک یان پێیان وایە کە مارە دەکرێت ئەویش بەڵگەیان فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم) کەدوارۆژی نوێژ نەکەر دەگەڕێنێتەوە بۆ ویستی خوا وە هەندێکیان پێیان وایە مارە ناکرێت کە بەڕاستی زۆرێک لە زانایان ئەم بەڵگەیەیان بە بەهێز تردانـاوە کە بەڵگەی فەرموودە و ئایەتی زیاتری لەسەرە کەوا ئەو کەسەی نوێژ نەکات بە مسوڵمان حسێب ناکرێت کەواتە**

**دەبێت هەردووکیان نوێژ بکەن.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**٣٠- ئایا سێگۆشەی بەرمۆدا لە ئایەت و فەرموودە ئاماژەی پێکراوە؟ ئەگەر بەڵێ چۆن؟**

**وەڵام:**

## الحمد لله الصلاة والسلام على رسول الله(صلى الله عليه وسلم) أما بعـد:-

**بێگومان خوای گەورە لە سورەتی کەهف دا لە ئایەتی ٥٤ دا لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:-**

(وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَذَا الْقُرْآنِ لِلنَّاسِ مِن كُلِّ مَثَلٍ وَكَانَ الإِنسَانُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلا)

**واتە: بەڕاستی ئێمە لەم قورئانەدا هێناومانەتەوە هەموو جۆرە نموونەیەک بۆ خەڵکی، بەڵام هەمیشە ئینسان لە هەموو شتێ زیاتر موجادەلە دەکات.**

**منیش دەڵێم بەڵێ خوای گەورە باسی کردوە، بەڵام نەک بەو شێوەیەی کە بەڕێزت چاوەڕوانی بیت قورئان نهێنیەکی زۆر جوانی هەیە ئەویش ئەوەیە کە شتێکت بۆ دەردەخات لەپاش دا دەبێت خۆت بگەڕێیت بەدوایدا ئەمەش لە دوایدا زیاتر ڕاستیەتی ئەم قورئانە پیرۆزەمان بۆ دەردەخات کە چەند شتی شاراوەیی هەیە هێشتا ئینسان نەگەشتۆتە ئەو ئاستە پەی پێ بەرێت بەڕێز زانستو تەکنەلۆجیای سەردەم هەموو ئەمانە ڕاستین و زانیاری تەواو تەنها لای خوای گەورەیە و سێگۆشەیەداو لەگومان و ڕاو بۆچون زیاتر هیچ شتێکی تری بۆ دەستەو ئەژنۆ بووە لە بەردەم ئەم ڕاستی فەرمووە خوای گەورە کە دەفەرموێت دەربارەی ئەم سێگۆشەیە مرۆڤایەتی پێ نیە.**

(وما اتيتم من العلم الا قليلا)

**خوای گەورەش زاناترە.**

**٣١- ماوەی دوو ساڵە قسە لەگەڵ خوشکەکەم ناکەم بەهۆی کێشەیەکەوە، ئایا گوناهباردەبم؟**

**وەڵام:**

## الحمد لله الصلاة والسلام على رسول الله(صلى الله عليه وسلم) أما بعـد:-

**بەڵێ بێگومان ئەگەر کێشەکە تەنیا کێشەی دونیایی بێت ئەوە گوناهبار دەبن، چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت حەلاڵ نیە بۆ دو کەسی ئیماندار لە سێ ڕۆژ زیاتر قسە نەکەن بەیەکەوە کەواتە حەرامە برا گیان قسە دابڕان لەگەڵ ئیمانداریک بۆ سێ ڕۆژ چ جای خوشک و برایی شیری کە بەڕاستی دە بێت ئاشتی کەیتەوە و داوای لێبوردنیش لە خوای گەورە بکەن چونکە خوا پەنامان بدات لەفەر موودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت هەموو ڕۆژێکی دوشەممە و پێنج شەممان کردەوەی ئینسان بەرز دەکرێنەوە بۆ ئاسمان وە خوای گەورە لە هەموو بەندەیەکی ئیماندار خۆش دەبێت ئەگەر شەریکی بۆ خوا بڕیار نەدابێت لەگەڵ دوو کەسێ ئیماندار کە قسە نەکەن بەیەکەوە فریشتەکان پرسیار دەکەن ئەی ئەم دوانە چی لێبکەین خوای گەورەش دەفەرموێت لێیان گەڕێن با ئاشت ببنە وە ئەمەو دەیان ئایەت و فەرمودەی کە کەزۆر جەخت لەسەر برایەتی دەکاتەوە ئەوەش بزانە کە دەڵێم برایەتی واتە خوشکیش دەگرێتە وە کەواتە زوو دەست پێشخەری بکە برا گیان بەڵکو خوای گەورە لێمان خۆش بێت.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**تێبینی:- جۆری کێشە کە تان باس نەکرد بوو بۆیە ئەم وەڵامەم بۆ نوسیت.**

**٣٢- من گەنجێکی تەمەن ٢٠ساڵم ئەگەر کەسێک داوام لێبکات کە کچێکی خۆی یان کەسێکی چۆن وەڵامی بدەمەوە، بە چی خۆییم لێمارە بکات، ئایا ئەگەر وەڵامەکەم بەبەڵێ بوو ئسلوبێک، هەروەها ئەگەر وەڵامەکەم بە نەخێر بوو بە چی ئسلوبێک وەڵام بدەمەوە؟**

**وەڵام:**

## الحمد لله الصلاة والسلام على رسول الله(صلى الله عليه وسلم) أما بعـد:-

١- له وەڵامدا بڵێ سوپاسی خوای گەورە دەکەم بەووەی کە کەسێکی وەک بەڕێزتـان بکاتە باوکی دووەمم کە بڕیارت داوە ئەو شەرە فە جوانەم پێ ببە خشیت وە منیش هەوڵ دەدەم هاوسەرێکی باش بم بۆ کچی بە ڕێزتـان إن شاألله وە خوای گەورە پاداشتی خێرتـان بداتەوە .

٢- له وەڵامی دووەم دا بڵێ سوپاسی خوای گەورە دەکەم بەوەی کە کەسێکی وەک بەڕێزتـان بکاتە باوکی دووەمم کە بڕیارت داوە ئەو شە رەفە جوانەم پێ ببەخشیت، بەڵام بە شێوازێک بڵێ جارێ بە تەمای هاوسەرگیری نیم هەر کات بیرم لێکردەوە ئەو کات قسەی لەسەر دەکەین وە واش مەکەن کە چاوە ڕوانی من بن هەر کات کەسێک هاتە داوایی و بە دڵتان بوو بیدەنێ با نەبە سترێتەوە بە منەوە وە خوای گەورە پاداشتی خێرتـان بداتەوە وا لە ناو ئەو هەموو کەسە منت هەڵبژارد.

خوای گەورەش زاناترە.

٣٣- ئایا ئەگەر جێڵ بدرێت لە قژ دەستنوێژی دروستە؟ یان دەبێت پێش دەستنوێژ سەرم بشۆم؟

وەڵام:

## الحمد لله الصلاة والسلام على رسول الله(صلى الله عليه وسلم) أما بعـد:-

بەڵێ دە ست نوێژ دروستە بەو مەرجە ی قژت ئاوەکەی بەر بکەوێت واتە جێڵەکە نەبێتە بەربە ست بۆ مەسحی سەرت کە ئاوەکەی بەرنەکەوێت وە ئەگەر هەر بویە ڕێگر پێویست ناکات هەموو سەرت بشۆیت بە شێکی قژت بشۆ کە جێڵەکە بۆتە بەر بەست وە ئەگەر بەڕۆنی زەیتون قژت چەور کرد ئەوە پێویست ناکات بیشۆیت.

خوای گەورەش زاناترە.

**٣٤- ئایا ڕەحمی خوای گەورە بۆ بەندەکانی تا چ ڕادەیەکە؟ واتا خوای گەورە لە چ گوناهێک خۆش نابێت؟ ئایا ئەم ئایەت و فەرمودانە تەفسیریان چۆنە؟ بسم الله الرحمن الرحيم ﴿إن الله لا يغفر أن يشرک به و يغفر مادون ذلک لمن يشاء ... هەروەها قل يا عبادي الذين أسرفوا على أنفسهم لاتقنطوا من رحمة الله إن الله يغفر الذنوب جميعًا.. هەروەها يا ابن آدم ! إنک لو أتيتني بذنوب كثيرة، ثم لقيتني لا تشرک بي شيئًا، لأبدلتک مكانها مغفرة / رواه الترمذي بەسپاسەوە.**

**وەڵام:**

## الحمد لله الصلاة والسلام على رسول الله(صلى الله عليه وسلم) أما بعـد:-

**بێگومان خوای پەروەردگار١٠٠ ڕەحمی هەیە لەو ١٠٠ ڕە حمەی ١ ڕەحمی دابەزاندۆتە سەر زەوی کە شمولی باوڕدارو بێباوەڕو دوڕوو جن و ئاژەڵ و باڵدارو ئەوەی لەسەر ئەم زەوییەیە تەنیا لەو ڕەحمەیە کە شمولی دەکات وە ئەگەر دایکێک بێنینە پێش چاوی خۆمان کاتێک کە لە مناڵەکەی دووربێت دەستی نەیگاتێ منالی لە برساندا هەر دەگری کاتێک بە پەلە خۆی دەگەیەنێتە ماڵەوە پەلاماری مزاڵەکەی دەدات لە حەسرەتدا مەمکی دەخاتە دەمیەوە وشیری دەداتێ پێغەمبەری خوا ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ دەفەرموێت خوای گەورە لەو دایکە بەڕەحم تر بۆ بەندەکانی، وە ٩٩ ڕەحمەکەی تری بۆ قییامەت هەڵگرتوە کە مژدەیەکی خۆ ش دەداتە دڵی ئیمانداران چونکە تەنیا شمولی ئیمانداران دەکات جا برای بەڕێزم بیهێنە پێش چاوی خۆت ئەو ڕەحمەی دونیا تەنیا یەک ڕەحمە ئاوها بەر بڵاوی کردوە بەسەر هەموو مەخلوقاتیدا جا وەرە ئەگەر ٩٩ بێت و تەنیا بۆ یەکێک لەمە خلوقاتەکانی بێت کەواتە ئەندازەی ڕەحمی خوا بۆ بەندەکانی بەدەم تەحدید ناکرێت چوونکە هەر چەند بڵێین هەر کەمە، خوای گەورە لە ﴿شیرک﴾ واتە: ﴿داوەڵ بڕیاردان﴾ خۆش نابێت وەک دەفەرموێت:-**

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ﴾

**سورە تی﴿النساء/١١٦﴾**

**واته:- خوای گەورە بە هیچ شێوازێک لە شەریک بڕیاردان خۆش نابێت وە لە غەیری ئەم لە هەر تاوانێک خۆش دەبێت کە خۆی ویستی لەسەر بێت وە شیرکیش دەکرێت بە دوو جۆرەوە شیرکی گەورە وە شیرکی بچووک ئەوەی شیرکی گەورەی تێدا بێت گەر تەوبە نەکات قەت خوا لێی خۆش نابێت وەک قوربانیدان بۆ غە یری خوا........هتد، وە شیرکی بچوک تاوانەکەی هێندەی ئەوەیە کە تاوانێکی گەورەت ئەنجام دا بێت خوا پەنامان بدات بۆ نمونە سوێند خواردن بە غەیری خوا ئەمە شیرکی بچووکە، بەڵام خوا پەنامان بدات تاوانی وەک ئەوە وایە کە زینایەکت کرد بێت ئەمە دەکرێت زیاتر لە کتێبە عەقیدەییەکاندا بەدوایدا بگەڕێیت وە گرنگە شارەزای بین، تەفسیری ئایەتە کەش بەم شێوەیە کاتێک وەحشی ئیمامی حەمزەی شەهید کرد کە مامی پێغەمبەر بوو کە مەککە فەتح کرا ڕۆژ لە مەککە بە سەر هاتە کە دورو درێژە ئەم ئایەتە لەسەر ئەودا بەزی کە ئەمە ماناکەیەتی (ئە ی محمد (صلى الله عليه وسلم) بڵێ ئەی بەندەکانم ئەی ئەوانەی کە خۆتان زۆر گوناهبار کردوە نائو مێد مەبن لە میهرەبانی و بەزەیی خوا چونکە بێگومان خوا لە هەموو گوناهەکانتان خۆش دەبێت بەڕاستی هەر ئەوە لێبوردە و بە بەزە ییە) کاتێک وەحشی ئەم ئایەتەی بیست گەڕایە وە بۆ مەککە و مسوڵمان بوو لەکاتێکدا مامی پێغەمبەری خواشی شەهید کرد بوو، بەڵام لە بەرامبەردا دوایی گەورەترین سەرکردەی کوفری کوشت کە ئیدیعای پێغەمبەرایەتی دەکرد ئەویش موسەیلەمەی کەزاب بوو.**

**فەرموودەکەش ماناکەی ئەوەیە کە دەفەرموێت:- ئەی نەوە ی ئادەم ئەگەر گوناهێکی زۆرئە نجام بدەیت و پاشان بێیتە وە بۆ لام بەڵام هاوەڵت بۆ بڕیار نەدابێتم ئەوا بۆتی دەگۆڕم بە لێخۆش بوون، سوپاس بۆ خوای گەورە.**

**وە خوای گەورەش زاناترە.**

**٣٥- من لە دوکانێک ئیش ئەکەم مەجالی دەست نوێژم کەمە، ئایا دەتوانم دەست نوێژی بەیانی بە قاچی تەڕەوە گۆرەوی پاک لە پێ بکەم و دەستنوێژەکانی تریش تەنها دەستی تەڕ بەسەر قاچمدا بهێنم؟**

**وەڵام:**

## الحمد لله الصلاة والسلام على رسول الله(صلى الله عليه وسلم) أما بعـد:-

**بەڵێ بەو مەرجەی دەست نوێژت هەبوبێت ئەوجا گۆرەویە کە یان خوفە کە لە پێ بکەیت وە دەتوانی بۆ ماوەی شەورۆژێک مەسحی لەسەر بکەیت هیچ ئیشکالێکی تێدا نیە ئەمە ئە گە ر لە ماڵ دا بویت، بەڵام ئەگەر لە سە فە ردا بویت ئەوا دەتوانیت تا سێ رۆژ نوێژی پێوە بکەیت و تەنیا مەسحی بەسەردا بکەیت وە ئەو حاڵەتە بۆ کاتی ئاسایش دە بێت نەک پێمان وابێت تەنیا لە زەرورێدا بەکاری بێنین بەڵام دەبێت ئاگاداری ئە وەبین ئەگەر جارێک لە جاران گۆرەویەکە یان خوفەکە دابکەنین ئەوا سەر لەنوێ دەبێت دەست نوێژ بگریتەوە واتە قاچت بشۆیتەوە با کاتیشت مابێت چونکە بە داکەندنی بەتاڵ دەبێتەوە،بە ڵام دە ست نوێژە کە تبە تاڵ نابێتە وە مە گە ر بە یە کێ لەتانە ی کە دە ست نوێژی پێ بە تاڵ دە بێتە وە لە شە رعدا.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**٣٦- ئایا حوکمی نێربازی چیە؟**

**وەڵام:**

## الحمد لله الصلاة والسلام على رسول الله(صلى الله عليه وسلم) أما بعـد:-

**ابن القیم ڕەحمەتی خوای لێبێت نقلّی کردوە کە سەرجەم هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەسەر ئەوەن کە ئەوەی ئەم کارە دەکات دەبێت بکوژرێت، بەڵام لە چۆنییەتی و شێوازی کوشتنەکەیدا جیاوازن، حەنبەلییە کانیش ئیجماعی صەحابەیان هێناوە لەسەر ئەوە ی حوکمی نێرباز کوشتنە بە بەڵگەی فەرموودەی**

(من وجدتموه يعمل عمل قوم لوط فاقتلوا الفاعل والمفعول به)

**[رواه التمذي(١٤٨١/٨/٣)وأبوداود(٤/رقم٤٤٦٢)وإبن ماجة (٢٥٦١/٨٥٦/٢)وهو حديث صحيح ،بڕوانه صحيح إبن ماجة (٢٠٥٧)والأرواء(٢٣٥٠)]**

**واته :- هەر کەسێکتان بینی ئەو کارە پیسەی گەلی لوط ی دەکرد ئەوا بکە رو لێکراو بکوژن، بەڵام وەک لەسەرە تادا باسمان کرد لە چۆنییەتی کوشتنە کەیدا ڕای جیاواز هەیە لەسەر کوشتنی جا بە سوتاندن بێت یان بەرد باران کردن یان خستنە خوارەوە لە جێیەکی بەرزدا و بەرد باران کردنی یان مل پەڕاندن یان دیوار ڕوخاندن بەسەریدا .........گرنگ ئەوەیە دەبێت بکوژرێن وە ئەم حوکمەش لە دارل إسلام دا جێ بەجێ دەکرێت.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**٣٧- سارا دەڵێت ئێمە لە ئەوروپا دەژین،هەندێک جار گۆشتی مریشک دەکرین لە بازاڕ لێی دەبین، ئەگەر ناچار بین؟ نەنوسراوە بە شێوەی حەلال سەربڕدراوە، ئایا گوناهبار**

**وەلام:**

## بسم الله الحمد ولله الصلاة والسلام على رسول الله أما بعد:-

**بێگومان خوشکی بەڕێزم مەسەلەی گۆشت کێشمەکێشێکی زۆری لەسەرە لە لایەن مسوڵمانانەوە بە گشتی زۆر جار ئەو گۆشتانەشی کە لێی دەنوسرێت حەڵاڵ دورن لەڕاستیەوە خوا پەنامان بدات جا لەبەر ئەم کێشانە پێویستە کەسێک کە ئەهلی بڕوا بێت شایەتی بدات لەسەر حەڵاڵێتی لەدارل کوفردا کە ئێمەی تێدا دەژین واتە ئەوروپاوە بەنسبەتی گۆشتی مارکێتەوە بێگومان ئەبێت ئاگادار بین کە حەرامن، چونکە ئێمە نازانین ئەو گۆشتانەی مارکێت سەرەدە بڕدرێن یان بەدەستی ئەهلی کیتاب واتە جولەکەو نەصرانی سەردە بڕێت!**

**بە ەەر حاڵ گەرزانیت گۆشتەکە سەردەبڕدرێت وە بەدەستی ئە هلی کیتابە ئەوا کێشە نیە بسم الله لێ دەکرێت و دەتوانن بیخۆن، بەڵام ئەگەر گۆشتەکە بەکارەبا بکوژرێتەوە یان بخکێندرێت یان غەیری ئەهلی کیتاب سەری ببڕێت ئەوا حەرامە و نابێت بیکرێت ولێی بخۆن.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**٣٨- سارا دەڵێت ئەگەر خۆت بشۆیت و پاشان نوێژ بکەیت ئایا دروستە؟ واتا دەست نوێژ نەشۆیت، ئایا ئاوی خۆشتنەکە دەبێتە دەست نوێژیش؟**

**وەڵام:**

## بسم الله الحمد ولله الصلاة والسلام على رسول الله أما بعد:-

**ئەو کاتەی کەخۆت دەشۆیت دەبێت نییەتی دەست نوێژ بێنیت چوونکە نییەت بەشێکە لە پایەکانی دەست نوێژوە هەرعیبادەتێکیش لە پایەدا باس بکرێت خوا پەنامان بدات بە نەکردنی پەرستنەکە بەتاڵ دەبێتەوە، نیەتەکەش شەرت نیە بەدەم بیڵێیت دەبێت لە دڵی خۆت دا بێت وە دەبێت ئەندامی دەست نوێژیشت بشۆیت وە ئەگەر لە کاتی خۆشۆردندا دەستت بەر عەورەتت کەوت ئەوا هیچ ئیشکالێکی تێدا نیەو دوای خۆشۆردنەکە بەم شێوەیە دەتوانیت نوێژەکەت بکەیت کەواتە بە تەنیا ئاوی خۆ شۆردنەکە نابێتە جێی دەست نوێژ بێ نییەت هێنان.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**٣٩- هەنار دەڵێت ئایا ژن و مێرد لە بە هەشتیش هەر بەیەکەوەن؟ ئەی ئەگەر یەکێکیان دۆزەخی بوو؟ ئایا ئەمە بە هەڵبژاردنی خۆیانە یان چۆنە تکایە بۆم رون بکەنەوە.**

**وەڵام:**

## بسم الله الحمد ولله الصلاة والسلام على رسول الله أما بعد:-

**بەڵێ بێگومان گەر هەردووکیان باوەڕدار بوون ئەوا لە بە هەشتیشدا پێکەوە ژیان دەبەنە سەر وە خوا پەنامان بدات گەر یەکێکیان دۆزەخی بوو ئەوا دەچێتە دۆزەخ ئەگەر باوەڕدارێکی تاوان بار بێت بەپێی تاوانی سزا دەدرێت و پاشان دەچێتە بەهەشت وە بێگومان ئەگەر یە کێکیان بێ باوەڕ بوو ئەوا بەهەتا هەتایە لە نێو دۆزە خ دا دەمێنیتەوە خوا پەنامان بدات وە خوای گەورەش وادەکات کە بەهەشتیەکە سۆزی بۆ دۆزەخیەکە نەچێت بە هەڵبژاردنیش نیە گەر بە هەڵبژاردن**

**بوایه دیاره پێغه مبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) له پێشتر بوو كه نەیتوانی شه فاعەت بۆ ئەبوطالب ی مامی بكات كه كافر بوو خوا پەنامان بدات.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**٤٠- شازاد دەڵێت من چەند مانگێک نوێژم فەوتاوەو قەزام نەکردۆتەوە، ئایا دەتوانم نوێژی سوننەت بکەم لەجێی ئەو نوێژانە، یان دەبێ بیان گێڕمەوە؟**

**وەڵام:**

## بسم الله الحمد ولله الصلاة والسلام على رسول الله أما بعد:-

**ئەو نوێژانەی كە فەوتاون گەر دەزانیت چەند نوێژن وە لە بیرت چوون ئەوا دەتوانیت بیان گێڕیتەوە، بەڵام ئەگەر نەت دەزانی چەندێكن یان بە ئەنقەست فەوتاندونت ئه وا تەوبەی لەسەربكە و نوێژی سوننەت زیاد بكە إن شا ألله دەچێتە بری ئەو نوێژانەی كە فەوتاون، بەنسبەتی قەزاكردنەوەی نوێژیش دیارە زانایان جیاوازیان هەیە لەسەر گێڕانەوەی هەندێك دەڵێن نوێژ قەزا دەكرێتە وە ئیتر هەر چۆنێک بێت وە هەندێكیان دەڵێن تە نیا لە دو حاڵەتدا دەتوانرێت نوێژ قەزا بكرێتەوە بۆ كەسێك كە نوێژی لە بیر چووبێت ئەوا هەر كات بیری كەوتە وە دەیكات، وە كەسێک خەوو تووبێت كاتێك خەبەری بویەوە كاتی نوێژەكەی نەماوە ئەمیش دەتوانێت نوێژەكەی بكاتەوە با كاتەكەشی تێپەڕبوبێت كە بەلای زۆرینەی زانایانەوە ئەم ڕایەیان لە پێشترە كە تەنیا بۆ ئەم دووحاڵەتە دەتوانرێت نوێژ بگێردرێتەوە، چونكە بەڵگەی فەرموودەی لەسەرە.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**٤١- چرا خان دەڵێت من دشەکەم بەتەمایە سنگ و مەمکی عەمەلیات بکات تا جوان بێت و چرچی نەمێنێت، وە دەڵێت بۆ كە مێردی خۆی ئەم تەجمیلە دەكات، ئایا ئەمە جایزە؟**

**وەڵام:**

## بسم الله الحمد ولله الصلاة والسلام على رسول الله أما بعد:-

**نەخێر خوشکی بەڕێزم جوانکاریە کە با بۆ مێردیشی بێت مادەم گۆڕینی دەست کردی خوای گەورەیە جائیز نیە تەنیا بۆ نەخۆشی لەلایەن زانایانی بەڕێزە وە ڕێگە دراوە بۆ نمونە وەک ئەوەی ئافرەتێک لووا لە مەمکی هات بێت ئەمە دەتوانێت عەمەلیاتی بکات.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**٤٢- هەڵوێست دەڵێت من لە شوێنێک ئیش دەکەم کە گۆشتی بەرازی تیایە، بەڵام ئەو بەشەی من پەیوەندی بە بەرازەوە نیە، بەڵام کەسێکی ترم بردووە بۆ ئیش ئەو دەستی بەر گۆشتی بەراز دەکەوێت، ئایا من گوناە بار بووم، چونکە ئەم کەسە بێ ئەوراقەو هیچ سەرچاوەی بژێوی نیە لە بەریتانیا، وە دەترسم بچێتە شوێنێکی کەو لە من دوور بکەوێتەوەو توشی شتی خراپ بێت، چونکە تەمەنی بیست ساڵە، الحمدلله لەوەتەی لای منە نوێژ دەکات، ئایا من گوناە بار بووم کە بردومەتە سەر ئەو ئیشە کە دەستی بەر گۆشتی بەراز دەکەوێت؟ تکایە بۆم ڕوون بکەنەوە.**

**وەڵام:**

## بسم الله الحمد ولله الصلاة والسلام على رسول الله أما بعد:-

**بەنسبەتی ئیشەکەی خۆتەوە هیچ ئیشکالێکی نیە بەڵام ئەو کەسەی کە بردوتە بۆ ئیشەکە ڕونت نەکردۆتەوە کەهەر لەسەر بەرازەکە ئیش دەکات؟ یان جارجار دەستی بەردەکەوێت؟ وە ئایا بە ڕووتی دەستی بەر بەرازەکە دەکەوێت؟ یان گۆشتی بەرازەکە لەناو زەرف دایە؟ چوونکە گەر بەرازەکە بەڕوتی دەستی بەربکەوێت ئەوا پێویستە غوسڵی دەستی دەر بکات بە ئاو قوڕیش وە ئەگەر ئیشی بەرازە کە جارجار لەلاینێکەوە هات ئەوا کاتەکەی حسێب بکات و پارەکە ی ئەو کاتە چەندی بەردەکەوێت دەری بکات و بیداتە سابون یان ئەشیای تەوالێت یان کفنی مردوو هە ندێک شتی کە هەن لە مزگەوتدا ئەوەش بزانێت کە ئەم پارەیە بۆ خێر بە کار نایەت بۆیە زانایان دە فەرموون بەکاری بهێنن بۆ ئەم شتانەوە بەنسبەتی یارمەتیدانی بەڕێزیشتە وە کارێکی**

**گەورەت ئەنجام داوە برا گیان دیارە بەڕێزیشتان نییەتی چا کەتان هەبووە نەک خراپ بۆیە خوای گەورە لەگەڵ نییەتی خۆتت لەگەڵ دەکات برا گیان مادەم ئەو برایە نوێژیش دەکات لای بەڕێزتان ئەمەیان هەر زۆر کارێکی گەورەیە چوونکە ئینسان بەنەکردنی نوێژ لە ئیسلام دەردەچێت بەڵام ئیشی بەرازەکە حەرامە واتە ئینسانی مسوڵمان تاوان باردەبێت وسزای لەسەروەر دەگرێ لە دائیرەی ئیسلام ناچێتە دەر.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**٤٣- شان دەڵێت من مێردەکەم چون بۆ ئەوروپا و نەیدەتوانی من بەرێت، جارێک بە تەلەفۆن پێی ووتم کەوا بەتەمایە ژنێکی ئەوروپی بهێنێت، من زۆرم پێناخۆش بوو، بەڵام پاش ماوەیەک مەعامەلەی بۆ کردم، بۆم دەرکەوت کە پەیوەندی هەیە لەگەڵ ئافرەتی تر و لەگەڵیان دەخەوێت هێناوە، بۆ دەکات و هیچ ڕێزێک بۆ من دانانێت، بەڵام ئێستا دەڵێت کە وازم و تەلەفۆنیان ئێستا بەشەو ئیشی تەکسی دەکات، ئیتر الله اعلم، ئایا من گوناه بار دەبم کە لەگەڵ کەسێکی دەسەلاتێکم نیە. ئاوادا بژیم ؟ ئێستا دوو منداڵم هەیەو هیچ**

**وەڵام:**

## بسم الله الحمد ولله الصلاة والسلام على رسول الله أما بعد:-

**سەرەتا ئینسانی مسوڵمان نابێت لەسەر گومان بڕیاربدات خوشکی بەڕێزم ئەگەر پیاوەکەت پێشتر ئەم کارانەی کرد بێت وە ئێستا پەشیمان بێت و تەوبەی لەسەر کرد بێت بەڕاستی ئەوا خوای گەورە لێی وەردەگرێت و لێی خۆ شدەبێت إن شاالله وە دەبێت تۆش یارمەتی دەری بیت لە مەسەلەی خۆجوان کردن و جیماع کردن لە گەڵ هاوسەرت دا، چونکە زۆر جار ئەم کێشانەوا لەپیاو دەکات کە بەرەو کاری خراپ بڕوات بێگومان نابێت کرداری ڕابردوی بدەیتەوە بە ڕویدا وە ئەگەر بەڵگەت لەسەری گر ت و زانیت هەر خەریکی کاری ناشایستەیە لە پشتی تۆ وە ئەوکات دەتوانیت داوای جیا بونەوەی لێ بکەیت لەڕوی شەرعەوە وە کەسیش تاوانی کەس هەل ناگرێت نەخێر بێگومان تۆ تاوان بارنیت لە کاری خراپی هاوسەرت.**

خوای گەورەش زاناترە.

٤٤- سەلام دەڵێت دوا کەوتنی نوێژی عیشا خێری زۆرە بەڵام ئایا ئەمە عەکسی سورەتی ماعون نیە؟ تکایە بە بەڵگە وەڵاممان بدەنەوە.

وەڵام:

بسم الله الحمد ولله الصلاة والسلام على رسول الله أما بعد:-

سەرەتا کردنی نوێژ لە کاتی خۆیدا بەڵگەی ئایەتی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليهوسلم)ی لەسەرە کە کاتی بۆ دیاری کراوە و دەبێت لە کاتی خۆیاندا بکرێن، بەڵام ئەوەی کە باسی لێوە دەکرێت لە لایەن زانایانەوە بۆ دواخستنی نوێژی عیشا مەبەست لەوەیە کە دوات خست شەو نوێژی لەگەڵدا بکەیت نەک بەبێ عوزر دوای بخەیت برای بەڕێزم بێگومان هەرکەسێک نوێژی عیشای دواخست بێ عوزر ئەوە بەر ئەو ئایەتە دە کەوێت کە لە سو رەتی ماعون دا خوای گەورە باسی ئەو کەسانە دەکات کە کە متەرخەمن لە نوێژەکانیان دا خوا پەنامان بدات.

خوای گەورەش زاناترە.

٤٥-عەلی دەڵێت باوکم بە بێ هۆ قسەم لەگەڵ ناکات، من چوارجار هەوڵم داوە کە قسەم لەگەڵ بکات بەڵام ئەو نایەوێت، چارم چیە؟

وەڵام:

بسم الله الحمد ولله الصلاة والسلام على رسول الله أما بعد:-

چارت ئەوەیە كە  نەک چوار جار ١٠ جاریش قسەت لەگەڵ نەكات تۆ هەر دە بێت پەیوە ندی لێ دانەبڕیت بەردەوام قسەی لەگەل بكەیت، چونكە ئەگەر دایک وباوكت كافریش بن هەر دەبێت گوێ ڕا یەڵیان بكەیت تەنیا لەفەرمان دەرچوونی خواو پێغەمبەرەكەی (صلی الله علیه وسلم) گوێ ڕایەڵیان نا كەیت براگیان وە بۆا نەباوكت لەچی شتێكت بیتاقەت بوە داوای لێبوردنی لێ بكە لەوبارەیەوە برا گیان، چونكە لەپاش ڕازی بونی خواو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەبێت گوێ ڕایەڵی دایک و باوک بكەین وە تەنیا ئۆفێكیش نەكەین لە بەرامبەریان دا وە ئەگەر هەر بەبێ هۆ باوكت قسەت لەگەل ناكات ئەوا تۆ تاوانبار نابیت إن شاألله.

**خوای گه ورەش زاناترە.**

**٤٦-خەمبار دەڵێت بەڕێزان من دایم دڵم تەنگەو بەهیچ دڵم خۆش  نابێت، بەشتی خۆشیش دڵم خۆش نابێت، هەموو كات حەز دەكەم زوو ڕۆژی قیامەت زۆر كەسی موسڵمانی بەڕێز هاوڕێیەتیم بێت یان زوو بمرم، حەز دەكەم دووركەومەوە لێیان و دڵم پێیان تووند  دەكەن بەلاٌم من دەبێت،تكایە چارەیەک.**

**وەلاٌم:**

## بسم الله الحمد ولله الصلاة والسلام على رسول الله أما بعد:-

بێگومان ژیانی دوونیا لەبەر ئەوە ی خۆشیەكانی كاتیە بۆ ئینسانی باوەڕدار خۆش نیە چونكە باوەڕدار چەندێک لەخۆشی دا بژیت ناگاتە  سلاتێكی ئەو بەهەشتە نەبڕاوەی كەنەچاو  بینویەتی نەزمان تامی كردوە نەگوێ بیستویەتی وە كاتێک دەبێت ئێمە داوای مردن بكەین كەوا توێشویەكی پڕمان پێ بێت بۆ لای خوای گەورە، چونكە ناشێت ئێمە  بڕۆین بۆ سەفەرێک كە حەزو ئاواتیشمان بێت بەلاٌم بێ توێشوو بە تایبەتی سەفەری قیامەت كە ڕێگەی هەمووانە جا خۆش بەختی بۆ ئەو كەسەی بەكردەوەیەكی بلوەڕدارانە و جوانە وە ڕێگەی خوای گرتۆتە بەر دەڕوات بۆ ئەوسە فەرە كۆتا نەهاتوە وە دەردەسەریش بۆ ئەوكەسەی كە بێ تو ێشو حەز بەو سەفەرە دەكات لە بەر نارەحەتی دونیا حەز بە مردن دەكات جا ئەگەر بەرگەی ئەم نارەحەتیە كە نەما نەگریت چۆن بەرگەی ئازاری سەختی ئە ولادە گریت خوا پەنامان بدات بێگومان بەرێز

**خەمبار دە بێت خەمە کانت بۆ دوارۆژت بێت نەک بۆ شتێکی کەهی دو نیا وە تا ئەتوانی هاورێ مسوڵمانەکانت لەدەست نەدەیت چونکە ئەوە نەفس و شەیطانە وات لی دەکات کە ڕقت لەهاورێی باش بێتەوە وە بیر ختنە وەشم بۆ بەرێزتان ئەوەیە کە نوێژو عیبادەتەکانت لە کاتی خۆیدا بکەیت گەرم وگوڕ بیت تییایاندا هەر کاتیس بێتاقەت بویت گوێ بگرە لەقورئان یان قورئان بخوێنە یان گوێ لە مامۆستایانی بەرێز بگرە تا بەوتەی جوانیان گۆش بکرێیت وە هەوڵیش مەدە بیر زۆر بکەیتەوە لەشتێک کەدەزانی سودیشت پی ناگەیەنێت چونکە شەیطان لەو کاتەنەدا زەفەر دێنیت پێمان وە هەوڵیش مەدە برادەرە مسوڵمانەکانت لەدەست بدەیت.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**٤٧-لە نوێژدا خەیاڵم دەڕوات چارم چیە؟**

**وەڵام:**

## بسم الله الحمد لله الصلاة والسلام على رسول الله(صلى الله عليه وسلم) أما بعد:-

**بێگومان لە نوێژدا ئینسان خەیاڵی دەڕوات بەڵام ئەمەش دەکەوێتە سەر نوێژ خوێنەکە کە چەندێک بیری لای نوێژەکەیەتی زانایان دەفەرموون: کاتێک کەسێک نوێژ دەکات باش وایە لە کاتی خوێندنی پایە کانی نوێژدا بۆ ئەوەی خەیاڵی نەڕوات کەمێک دەنگ بەرز بکاتەوە تا گوێی لە دەنگی خۆی ببێت، ئەوەندەش نا کە خەڵکانی چواردەورت نوێژیان لێ هەڵە بێت تەنیا خۆت گوێت لە دەنگی خۆت بێت ئەمەش باشترین شتە بۆ ئەوەی ئینسانی ئیماندار ئاگای لە نوێژەکەی بێت یان ئەگەر هەوڵ بدرێت لە مانای ئەو سورەتەی کە دەیخوێنێت تێبگەیت هەر زۆر باشە، لەلایەکی ترە وە زانایان دەفەرموون لە نوێژدا نوێژ خوێن خەیاڵی هەر دەڕوات ئەگەر هەر خەیاڵت ڕۆشت ئەوا بیری مردن بکەرەوە چوونکە مردن هەموو شتێکت لە بیردە باتەوە مەگەر دڵێک ڕەق بوویێت خوا پەنامان بدات کە مردنیش کاری تێنە کات هەربۆیە کاتێک هاوەڵان نوێژیان دەکرد ئەو ڕێڕەوەی کە لە بەردەمیاندا بوو وەک گۆڕێک سەیریان دەکرد، وە کاتێک سەلامیان دەدایەوە ئەو کات دەچوونە وە سەر کاری دونیاییان.**

**إن شاألله بەڕێزیشتان یەكێك لەم هۆكارانە بگرە بەر بەڵكو خەیاڵتان كەم ببێتەوە.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**٤٨-ئایا نێرە موك لە میراتدا چۆنی بەردەكەوێت كە نە كچە و نە كوڕە؟**

**وەلام:**

## بسم الله الحمد لله الصلاة والسلام على رسول الله(صلى الله عليه وسلم) أما بعد:-

**ئیمامی عەلی (ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت) لەبەشی میرات دا بەم شێوەیە دیاری كردوە بۆ كەسێك كە نێرە موك بێت.**

**ئەگەر كەسە نێرەموكەكە بەشی پیاوزاڵ بوو بەسەریدا وە لەبەشی نێرینە وە میز بكات ئەوە لەمیراتدا وەك پیاو بەشی دەكەوێت، وە بە پێچەوانە وە ئەگەر بەشی ئافرەت زاڵ بوو بە سەریدا وە لە بەشی مێینە وە میز بكات ئەوە حسابی ئافرەتی بۆ دەكرێت و وە میراتی وەك ئافرەت بەردەكەوێت،**

**بەلاٌم ئەگەر هاتوو بە میز دەرنەكەوت ئەوە دەچێتە سەر پەراسوە كان حسابی دەكەیت، چوونكە ئافرەت پەراسوی لە پیاو كەمترە وە پیاو پەراسوی زیاترە ئەوە بەوەدا جیای دەكەینەوە كە پیاو بێت یان ئافرەت یان سەیری ڕوخساری دەكەیت وەك ئەوەی سنگ و مەمكی هەبێت و ڕیشی نەبێت ئەوە بە ئافرەت حساب دەكرێت ئەگەر بە پێچەوانەشەوە بوو ئەوە بە پیاو حسێب دەكرێت، زانایان دەفەرموون سەیریش بكرێت ئایا زیاتر لە ناو ژنان دا دادە نیشێت یان لە ناو پیاوان دا.**

**ئەگەر هاتوو نێرە موكەكە لەدایك بوو هیچ كام لەم سیفەتانەی تێدا نەبوو تەنانەت دایكیشی نەیدەزانی ئەوە لە میراتدا حسابی كوڕ و كچی بۆ ناكرێت، بەڵكو بەم شێوە یە میرات بەسەریدا دابەش دەكرێت بۆ نموونە ٢٢٥ دینارمان هەیە دەمانەوێت دابەشی بكەین بە سەر سێ**

منالّ دا یەکیان کوورِێت و یەکیان کچ بێت و یەکێکیشیان نێرە موک بێت کە نە بەشی پیاو بەسەریدا زاڵە نە ئافرەتیش ئەوە بەم شێوەیە میراتەکە دابەش دەکرێت

کوورە کە ١٠٠دینار

کچە کە ٥٠دینار

نێرە مووکەکەش٧٥دینار

واتە نە وەک کچەکەی بەردەکەوێت نەوەک کورِەکەش.

خوای گەورەش زاناترە.

٤٩- بەرِێزان من ئیش دەکەم و تەنها مەجالی نوێژی بەیانی و عیشام هەیە و بە هیچ جۆرێک مەجالی نوێژەکانی ترم نیە، چونکە دواى مەغریب ئیشەکەم تەواو دەبێت، چارەم چیە؟

وەلآم:

بسم الله الحمد لله الصلاة والسلام على رسول الله(صلى الله عليه وسلم) أما بعد:-

بەنسبەتی نوێژەکانتەوە برای بەرِێزم خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

(إن الصلاة كانت على المؤمنين كتابا موقوتا) سورەتی النساء(١٠٣)

واتە:- چوونکە بەراستی نوێژ لەسەر ئیمانداران فەرزە لەکاتی دیاریکراودا دەبێ ئەنجام بدرێت.

کەواتە ناگونجێت ئێمە کاری دونیامان بخەینە پێش ئاخیرەتەوە چوونکە دونیا کۆتایی پێ دێت برای بەرِێزم بەلآم کردنی نوێژەکانت لەکاتی خۆیدا دەبێتە هۆی رزگاربوونی ئاخیرەتت إن

**شاألله، بۆئەوەی بەڕێزتان ئیشەکە شتان لە دەست نەچێت دەتوانن بەم شێوازە نوێژەکانت ئەنجام بدەیت بەو مەرجەی عوزری شەرعیت هەبێت وەک ئەوەی کە قەرزار بیت.**

**١-نوێژی بەیانی لەکاتی خۆیدا بکە چوونکە بەیانی لەگەڵ هیچ نوێژێکدا جەمع ناکرێت.**

**٢-ئەوەی کە کێشەی بەڕێزتانە نوێژی نیوەڕۆو عەسرە چوونکە ئێوارە دەتوانیت جەمع بکەیت لەگەڵ عیشادا.**

**تۆ ئەگەر بتوانیت لەو شوێنەی کە ئیش دەکەیت لە کاتی ئیسراحەتدا ئیتر ئەگەر ئیسراحەتەکە بکەوێتە کاتی نوێژی نیوەڕۆ وە ئەوە بەم شێوەیە هەردوو نوێژی نیوەڕۆو عەسرەکەت دەکەیت.**

**نوێژەکەت نییەتی جەمع و تەقدیمی لێ دەهێنیت واتە نوێژی عەسر دەهێنیتە تەنیشت نیوەڕۆ ئەمەش بەم شێوەیە دەکەیت چوار ڕکاتی نیوە ڕۆکەت دەکەیت پاشان چوار ڕکاتی نوێژی عە سر.**

**بەڵام ئەگەر کاتی ئیسراحەتەکەت لە نوێژی عەسردا بوو ئەوا**

**نوێژەکەت نییەتی جەمع و تەئخیری لێ دەهێنیت واتە نوێژی نیوە ڕۆکەت دەبەیتە لای عەسر ئەمەش بەم شێوەیە دەکرێت دەبێت چوار ڕکاتی نیوە ڕۆکەت بکەیت ئەوجا چوار ڕکاتی عەسرەکەت هەروەک کاتی نیوە ڕۆکە وایە تەنیا نییەتەکانی جیاوازن.**

**٣- وە نوێژی ئێوارە کەشت بخە لای عیشا و نییەتی جەمع و تەئخیری لێ بهێنە واتە ئێوارە دەخەیتە تەنیشت عیشا ئەمیش سێ ڕکات نوێژی ئێوارە کەت دەکەیت ئەوجا چوار ڕکاتی عیشاکەت.**

**بەڵام برای بەڕێزم کردنی نوێژەکانت بەجەمع لە حاڵەتی ئیش کردن دا زانایان تەنیا بۆ کەسێک ڕێگەیان پێداوە کەوا قەرزار بێت ئەگینا دەبێت ئیشەکەی بگۆڕێت.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

**٥٠- من پێشتر شارەزای تەڵاق نەبووم بۆیە زۆر کات لە کاتی توڕەبووندا تەڵاقم خواردووە مەبەستم ئەوە نەبوە کە خێزانم تەڵاق بدەم، یان تەڵاقم خواردوە ووتوومە ئەو شتە وایە کەچی جاری وا هەبووە شتەکە وا نەبوە، ئایا تەڵاقم کەوتووە؟**

**وەڵام:**

## بسم الله الحمد لله الصلاة والسلام على رسول الله(صلى الله عليه وسلم) أما بعد:-

**ئەگەر کەسێک زۆر تووڕە بێت و هەست نەکات چی دەڵێت لەو کاتەدا تەڵاق بخوات ئەوە تەڵاقی نەکەوتوە بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) (صفية بنت شيبة )کەوا فەرمووی (عائيشه)ی دایکی ئیمانداران (ڕەزای خوای لێبێت) بۆی گێڕاوەوە کە دەفەرمووێت:-**

(لاطلاق ولا عتاق في إغلاق)

**[رواه احمد (٦/٢٧٦)وأبوداود(٢/٦٤٢/٢١٩٣)وإبن ماجه (١/٦٦٠/٠٤٦)وهو حديث حسن بڕوانە صحيح سنن أبي داود (١٩٠٣)وصحيح إبن ماجه (١٦٦٥)]**

**واتە:- تەڵاق دان و ئازاد کردنی کۆیلە لەکاتی (إغلاق)دا نیە**

**مانای (إغلاق)لە فەرموودەکەدا بەم شێوەیەیە:-**

**زانایان بە تووڕە بوون و زۆر لێکردن و شێتیش تەفسیریان کردوە،**

**لە وانە ئیمامی(أحمد) (إغلاق)ی لەم فەرموودەیەدا بەتوڕە بوون داناوە،**

**وە(أبوداود)یش دەفەرمووێت من وای بۆ دەچم کە توڕە بوون بێت،**

**وەئیمامی (شافیعی)ش نەزری توڕەیی بە نەزری (غلق) ناو بردوە،**

**چوونکە توڕەیی دەرگای مەبەست و لەیەک جیاکردنەوە دادەخات، وە ئەگەر زۆر لێکردن (غلق)بێت، ئەوا توڕەبوون لە پێشترەکە وا (غلق)بێت بۆ زیاتر تێگەشتن لەم مەسەلەیە دەتوانیت سوود لە کتێبی** (إغاثة اللهفان في طلاق الغضبان)/لإبن قيم الجوزية **وەبگریت.**

**كەواتە طەڵاق خواردن لە كاتی تورەییدا ناكەوێت ئەمەش وات لێنەكات ئیتر تەڵاق خواردن بكەیتە پیشە وەک تەزبیحی دەست هەر كات تورە بویت یەكسەر تەلاقێكی پیا بكێشیت بلێیت قەیناكە خۆ ناكەوێت.**

**بەنسبەتی بەشی دووەمی پرسیارەكەتەوە كە دەڵێیت (یان تەڵاقم خواردوە ووتوومە ئەو شتە وایە كەچی جاری وا هەبووە شتەكە وانەبوە، ئایا تەڵاقم كەوتووە؟**

**ئەگەر نییەتی تەڵاقەكەت كە خواردووتە مەبەستی هاندان لە سەر كارێک بێت یان قەدەغە كردنی كارێک بێت، ئەوە بەسوێند دەژمێردرێت.**

**ئەگەر شتەكە وا دەرچوو ئەوە هیچی لەسەر نیە وە ئەگەریش وا دەرنەچوو ئەوە كەفارەتی سوێند دەدەیت. ئەمە ڕاو بۆ چوونی شێخ الإسلام (إبن تیمیة )و (إبن القیم )ی قوتابیەتی وە ئەمەش ڕای ڕاستە بۆ زانیاری زیاتریشت دەتوانیت سوود لە (مجموع الفتاوی الكبری (ج٣٣)وە ربگریت.**

**لە كۆتاییدا برای بەرێزم با ووریا بین ووشەی تەڵاق ووشەیە كە ڕێی پێدراوە لەلایەن خوای گەورەوە بۆ كۆتا پێهێنانی عەقدی زە واج ی نێوان پیاو ژنە ئەمەش بۆ چە ند حاڵەتێكە كەوا پیاو ژنەكە نەگونجێن بەیەكەوە نەوەک بیكەینە پیشەی بەردەوامماں كەوا لەگەڵ ڕێزم دا دەگێرنەوە كابرایەک ئەوەندە تەلاقی دەخوارد تا وای لێهات كەس گوێی لێ نەدەگرت دواتر كە بیویستایە تەڵاق بخوات لە ناچاریدا دەیووت بە تەلاقی كاكم خوا پە نامان بدات لێیان پرسی ئەوە خێرە گۆریوتە بە هی كاكت؟ وتی ئاخر ئەوەی خۆم سواوە ئەمە تەنیا بۆ زەردە خەنەیەک بوو.**

**خوای گەورەش زاناترە.**

وصلى الله على حبيبنا و شفيعنا محمد (صلى الله عليه وسلم) و على اله و أصحابه ومن تبعه بإحسان إلى يوم الدين (سبحانك اللهم وبحمدك أستغفروك و أتوب إليك

به پشتيوانى خواى گه وره ته واو بوو.......